# شەکسپیر

## ریچاردی سێیەم

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە
حەمە کەریم عارف

ناوی کتێب: ڕیچاردی سێیەم، ( شانۆنامە )
نووسەر: شەکسپیر
وەرگێڕ: حەمە کەریم عارف
تایپ: ڕزگار حەساری
هەڵەچن: سەرگوڵ محمد ئەمین
چاپ: چاپی یەکەم ٢٠٠٩ / چاپخانەی سایە

# پێشەكی

## ویلیام شەكسپیر (١٥٦٤- ١٦١٦)

سوڵتانی شاعیران و شانۆنامەنووسانی قەڕنان و ڕۆژگاران لە خێزانێكی بازرگاندا لە شاری جوانی ستراتفوریون ئەڤون چاوی بە دنیا هەڵێناوە. زانیارییەكی ئەوتۆ لەمەڕ ژیانی وی لە دەست دا نییە. لە زاگەی خۆی چووەتە قوتابخانە، لاتینی و كەمێك یۆنانی فێر بووەو ڕەنگە ماوەیەك كاری مامۆستایەتی كردبێ. شەكسپیر لە هەژدەساڵیدا (١٥٨٢) لەگەڵ ئافرەتێكی هەشت ساڵ لە خۆی گەورەتردا زەماوەندی كرد. لە ساڵی ١٥٨٥دا ئەشقی شانۆ بۆ لەندەنی بكێش كرد. لە ساڵی ١٥٩٤دا پەیوەندی بە "گروپی ئەكتەرانی لۆرد چەمبرلن"ەوە كرد، كە بەناوبانگترین گروپی شانۆیی بوو. لە ساڵی ١٥٩٧دا موڵكێكی فراوانی لە ستراتفورد كڕی، لە ساڵی ١٥٩٩دا بوو بە بەشدارێك لە تەمەشاخانەی تازە بونیادی گلوپ كە بنكەی گروپی لوردچەمبرلن بوو، بەرەبەرە بوو بە ناودارترین شانۆی سەردەم، لەم شانۆیەدا بوو كە ژمارەیەك لە بەناوبانگترین دراماكانی ئەو نمایش كران و بە دەرامەتی ئەو درامایانە سەروەتێكی پاشەكەوت كرد.

شەكسپیر لە ساڵی ١٥٩٢دا لە بواری درامانووسی و ئەكتەریدا بەناوبانگ بوو. یەكەمین بەرهەمی كە چاپ كران، بەیتەكانی: ڤینوس و ئەدۆنیس (١٥٩٣)و دەستدرێژی بۆ سەر لوكرس (١٥٩٤) بوو. شەكسپیر لەو زەمانەوە تا ساڵی ١٦١٣ كە لە ستراتفورد گۆشەگیر بوو، زنجیرە شانۆنامەیەكی نووسی كە بە گەورەترین درامایانی جیهان دەژمێردرێن.

وا دیارە هەوەڵین بەرهەمێن شەكسپیر هەندێ شانۆنامەی مێژوویی، وەك: هنری شەشەم (سێ بەش، ١٥٩٠، ١٥٩٢) بووە. شەكسپیر لە شانۆنامە مێژووییەكانی دواتریدا: ریچاردی سێیەم (١٥٩٣)و ریچاردی دووەم (١٥٩٥) لە هونەری خۆیدا دەگاتە باڵا دەستی.

یەكەمین تراجیدیای شەكسپیر، تیتوس ئەندرونیكوس (١٥٩٠- ١٥٩٢) بوو، و یەكەمین تراجیدیا لە زنجیرە تراجیدیا گەورەكانی: رومیو جولیت (١٥٩٦) بوو، پلۆتی رۆمیو جولیت عەشقێكی نایاب و خەمناك دەگێڕێتەوەو لە سەرانسەری جیهاندا مەنشورە، لەم تراجیدیایەدا مەرگی جووتە ئاشق، كە لە دوو بنەماڵەی دژمنن، تەنیا رێگەی هەڵاتنە لە واقیع و هەڵوێستی بێ هومێدی وان.

یەكەمین كۆمیدیای شەكسپیر، كومیدیای هەڵەكان (دەوروبەری ١٥٩٤) بوو. پلۆت و سكێچی ئەم شانۆنامەیە بە دەوری تەوەری لێكچوونی عەجیبی دوو كوڕی جمكانە لەگەڵ دوو خزمەتكاری جمكانەی ئەواندا، و ئەو هەڵانەی لەم لێكچوونەوە كەوتوونەتەوە، دەسوڕێتەوە. دوو كۆمیدیای دواتری شەكسپیر، دوو نەجیمزادەی ڤیرونا (دەوروبەری ١٥٩٢)و رەنجی بێهودەی ڤیان (دەوروبەری ١٥٩٤) بوون.

شەكسپیر لە ساڵی ١٥٩٤ەوە تا كۆتایی سەدە درەوشاوەترین كۆمیدیاكانی دەنووسێت: رامكردنی ژنی سەركێش (دەوروبەری ١٥٩٤)، خەونی شەوی نیوەی هاوین (دەوروبەری ١٥٩٥)، بازرگانی

ڤینیس (١٥٩٦)، هەر چۆنت بویٚ (١٥٩٩) هەرایەکی زۆر لەسەر هیچ (١٥٩٩)، ژنانی شادی وینزور ١٥٩٧- ١٦٠٠)و شەوی دوانزەیەم (١٥٩٩).

شەکسپیر باشترین شانۆنامە مێژوویيەکانی: هنری چوارەم (دوو بەشە، ١٥٩٧- ١٥٩٨)، هنری پێنجەم (١٥٩٨)و ریچاردی دووەم (١٥٩٥)ش لە فاسیلەی ساڵی ١٥٩٤ەوە تا کۆتایی سەدە دەنووسێت. شەکسپیر لە هنری چوارەمدا، کاراکتەری دێوئاسای کۆمیدی، واتە سێرجۆن فالستاف-ی بەخەڵکی دنیا ناساند، ئەم کاراکتەرە تەمەڵە فشەکەرە، کە لە کومیدیای ژنانی شادی وینزورشدا دەردەکەوێت، بە بەناوبانگترین سیمای کۆمیدی لە ئەدەبیاتی دراماتیکیدا دەژمێردریٚ.

قۆناغی داهێنانی تراجیدیا گەورەکانی شەکسپیر بە یولیوس قەیسەر (١٥٩٩- ١٦٠٠) دەست پێدەکات، ئەم تراجیدیایە، کە یەکێکە لە باشترین شانۆنامەکانی شەکسپیر، پیلان دژی یولیوس قەیسەر، کوشتنی یولیوس قەیسەر، وشکستی پیلانگێڕەکان لە رێگەی مارك ئانتونیی سەرداری رومییەوە وێنە دەگرێت. قارەمانی سەرەکی تراجیدیاکە بروتوسە کە لە پیلانی کوشتنی تزاردا دەست لەگەڵ پیلانگێڕەکان تێکەڵ دەکات. بە هەر حاڵ، شەکسپیر لە ماوەی ساڵانی ١٦٠٠- ١٦٠٩دا مەنشورترین تراجیدیاکانی دەنووسێت:

***هاملیت (دەوروبەری ١٦٠١):***

بەناوبانگترین شانۆنامەی شەکسپیرە و یەکێکە لە جوانترین دراماکانی ئەدەبیاتی جیهان، هاملێتی شازادەی دانیمارك، پاش مردنی بابی خاوەن تاجی، گیرۆدەی جۆرە ماخۆلیایەك دەبیٚ، پێی وایە کە مامی، کلاودیوس، کە لەگەڵ دایکیدا زەماوەندی کردووە، بووە بە پاشا، بکوژی باوکیەتی. تاپۆی بابی هاملێتیش دێتە بەرچاوی و کلاودیوس بە بکوژی خۆی دەزانیٚ. هاملێت دەکەوێتە بیری تۆڵەوە. بەڵام دەکەوێتە قوڵایی بیرکردنەوەو دووچاری دوو دڵییەکی کوشندە دەبێت. زۆر بیر دەکاتەوە بەڵام ناتوانیٚ دەست بە کار بیٚ، رازی گەورەیی شانۆنامەکەش لە تەبیعەتی غەریب و هزرڤانانەی ئەودا پەنهانە، کە پتر تەبیعەتی فەلسەفی و چەندو چوونی هەیە تا جۆش و خرۆشی جۆڵەو چالاکی.

***ئوتیللو (دەوروبەری ١٦٠٤):***

وەکو تراجیدیای هاملیت، شیکردنەوەیەکی قوڵی روحی مرۆڤە. ئەم شانۆنامەیە چیرۆکی ئوتیللوی زەنگی مەغریبی، فەرماندەی دلاوەری قۆشەنی فینیس لە قوبرس، و دزدەمۆنای هاوسەری جوانی دەگێڕێتەوە، ئوتیللو، پلەی کاسیو-ی عەسکەریی فلورانسی بەرز دەکاتەوەو بەبیٚ ئەوەی بزانیٚ دژمنایەتی و حەسوودی یاگۆ-ی سەربازی پیرو شەڕەنگێز دەوروژێنیٚ. یاگو بە درۆ هەواڵ دەگەیەنێتە ئوتیللو کە کاسیو و دزدەمونا پەیوەندی دڵداریان لە نێواندایە. ئوتیللو کە باوەڕ بەم قسەیە دەکات، دز دەمونا دەکوژێت. ئوتیللو کاتیٚ کە پەی بە هەڵە سامناکەکەی خۆی دەبات، داوا دەکات کە وەکو پیاوێك کە "نەك ئاقڵ، بەڵکو زۆر ئاشق بوو" یاد بکرێتەوەو خۆی دەکوژێت.

***شالیر (دەوروبەری ١٦٠٦):***

شەكسپیر لەم درامایەدا كە هەندێ بە گەورەترین تراجیدیای ئەوی دەزانن، دەست دەگەیەنێتە قوڵایی روحی بەشەر.

لیر- شای پیرو ماندووی بەریتانیا، كە شەیدای ستایشی درۆینەیە، قەڵەمڕەوی سەڵتەنەتەكەی بە دوو كیژە شەڕانی وشرِندە زمانلووسەكانی خۆی دەبەخشێت، و ئەم دوو كچەی ئەو لە وڵات و لانەی خۆی وەدەردەنەن.

***مەكبث (١٦٠٦):***

كورتترین شانۆنامەی شەكسپیرە، و خوێندنەوەیەكی قوڵە دەربارەی ترس. قارەمانی سەرەكی دراماكە، مەكبسە كە سێ ژنی سیحربازی رازئامێز پێشبینیان كردووە كە لە ئایندەدا دەبێت بە شای ئوسكاتلاند. و مەكبس لێدەبڕێ تا بە كۆمەكی چارەنووس دەسەڵاتی پاشایەتی بە دەست بێنێ. بە هاوكاری هاوسەرەكەی نامەردانە پاشا دەكوژێت، بەڵام رەنگی خوێنەكە بە هیچ شێوەیەك لە دەستی ئەو و ژنەكەی نابێتەوەو سەرەنجام ئەم خوێنە یەخەی ئەم دووانە دەگرێت.

***ئانتونی وكلیوپاترا (دەوروبەری ١٦٠٧):***

تراجیدیایەكی گەورەی دیكەی شەكسپیرە، بە دەوری تەوەری ڤیانی ئانتونیی سەرداری رومی و كلیوپاترای مەلیكەی میسردا دەسوڕێتەوە..

***كوریولانوس (دەوروبەری ١٦٠٨):***

بابەتی ئەم تراجیدیایە، ژیان و مردنی كایوس مارسیوس كوریولانوس-ی فەرماندەی لە خۆبایی رومییە كە ئاقیبەت بە هۆی غروری خۆیەوە تیا دەچێت.

***كوریولانوس و تیمونی ئاتینی (دەوروبەری ١٦٠٨):***

بە دوا تراجیدیای شەكسپیر دەژمێردرێ.

هەندێ لەو شانۆنامانەی دیكەی شەكسپیر كە لە فاسیلەی ساڵانی ١٦٠٠- ١٦٠٩دا نووسراون بریتیین لە: شانۆنامەی تەوسئامێزی: ترویلوس و كرسیدا (دەوروبەری ١٦٠١)و "دوو كۆمیدیای رەش" بە ناونیشانی: ئەو شتە خۆشە كە كۆتاییەكەی خۆش بێ (١٦٠٢)و پاداشتی كەستەك هاوێژ بەردە (دەوروبەری ١٦٠٤).

دوایەمین شانۆنامانی شەكسپیر دوو كۆمیدیای رۆمانسی و دڵگیرن كە چیرۆكی زستان (١٦١١)و تۆفان (دەوروبەری ١٦١٢)یان ناوە، كە تۆفان (گەرداو) لە راستیدا دوا شانۆنامەیەتی. شەكسپیر بەو سی و هەشت شانۆنامەیەی كە لەبەر رۆشنایی بلیمەتی سەیری خۆیدا نووسیونی، وەكو گەورەترین درامانووسی جیهانی شۆرەتی هەمیشەیی بەدەست هێنا. زێدەباری ئەمەش، شیعرە

گـەرمو پـڕ هەسـتـەكانی دراماكـانی، لـە ریـزی جـوانترین هـۆنراوانی زمـانی ئینگلیزیـدا دادەنـرێن ئەسڵەن شەكسپیر یەكێكە لە گەورەترین شاعیرانی لیریكی.

سـوناتەكانی شەكسـپیر (هـەمووی سـەدو پـەنجا و چـوار سـوناتـەن، ١٦٠٩)، كـە لـە سـاڵانی ١٥٩٣–١٦٠١دا هۆنراونەتەوە، لە جۆری خۆیاندا، لە جوانترین سوناتانی جیهانن، تایبەتمەنـدی سـەرەكی ئـەم سـوناتانە، كـە رەنگدانـەوەی زەوقـی مـوجیزە ئاسـای مۆسـیقی شـەكسـپیرن، توانـای دەربـڕینی هزری نایابە لەگەڵ هەستی ناسكو قوڵی هاوخەمیدا.

شەكسپیر سیمای تەواوی مرۆڤپەروەری رێنیسانسە. هاودەردی قوڵی لەگەڵ مرۆڤایەتیدا، ئەوی تا قوڵایی روحی كەسایەتی دراماكانی بردووەو بەهرەو توانای بێ وێنەی لە شیعردا، نەمری بە ژنانو پیاوانی شانۆنامەكانی بەخشیوە.

بڕوانە (مێژوی ئەدەبیاتی جیهان)،كتێبی سێیەم
ن:باكنر ب. تراویك      و: حمە كەری عارف
چاپی یەكەم   ٢٠٠٨، هەولێر، ناوەندی بڵاوكردنەوەی ئاوێر

## کاراکتەرەکان

١-  شا ئیدواردی چوارەم
٢-  ئیدوارد، میری ( شازادە ) ویڵز ( شا ئیدواردی پێنجەمی دواتر )-کوری پاشا
٣-  ریچارد، دوکی یورك – کوری پاشا
٤-  جۆرج، دۆك کلارنس- برای پاشا
٥-  ریچارد، دۆگ گلۆستەر ( ریچاردی سێیەمی دواتر- برای پاشا
٦-  کورِیژگەیەکی دۆك کلارنس
٧-  هنری، ئێرل ریچموند ( شا هنری حەوتەمی دواتر )
٨-  کاردینال بورچێر ( مەزنی قەشەکانی کۆنتربری )
٩-  تۆماس روترهام ( سەر ئوسقوفی یورك )
١٠- جون مورتون  ( ئوسقوفی ئیلی )
١١- دۆك بکینگهام
١٢- دۆك نورفوك
١٣- ئێرل سوری ( کورِی دۆك نورفوك )
١٤- ئێرل ریڤەرز ( برای شابانۆ ئیلیزابت )-
١٥- مەرکیز دورست – کوری ئیلیزابیت
١٦- لۆرد گرای- کوری ئیلیزابیت
١٧- ئێرل ئۆکسفورد
١٨- لۆرد هیستنگز
١٩- لۆرد ستانلی ( ئێرل "داربی"شی پێدەگوترێ )
٢٠- لۆرد لوڤیل
٢١- سێر تۆماس ڤوگان
٢٢- سێر ریچارد راتکلیف
٢٣- سێر ویلیام کاتسبی
٢٤- سێر جیمز تیرل
٢٥- سێر جمیز بلانت

٢٦- سێر والتر هربرت

٢٧- سێر روبرت براكنبوری ( فەرماندەی پۆلیسی بورج )

٢٨- كریستوفر ئیرزوك ( قەشە )

٢٩- قەشەیەكی دی.

٣٠- تریسلی و بیركلی ( دوو نەجیمزادەی زێرەڤانی لیدی ئان )ن.

٣١- شارداری لەندەن، ( دارۆغە ویلتشیر )

٣٢- ئەلیزابت ( شابانۆ، ژنی ئیدواردی چوارەم ).

٣٣- مارگرێت ( بێوەژنی هنری شەشەم ).

٣٤- دۆكبانۆی یورك ( دیكی شا ئیدواردی چوارەم )

٣٥- لیدی ئان ( بێوەژنی ئیدواردی میری ویلز و كوڕی هنری شەشەم، كە پاشان شوی بە ریچاردی سێیەم كرد ).

٣٦- مارگرێت پلانتاجنت ( كیژۆڵەیەكی كلارنس )ـە.

٣٧- تارمایی كوژراوانی دەستی ریچاردی سێیەم.

٣٨- كۆمەڵێك لۆرد و دەست و پێوەندانی دی، ئەفسەرێك، كاتبێك، هاووڵاتیان، بكوژان، پەیك و تەتەران، سەربازان و كەسانی دی.

شوێن : ئینگلتەرا.

## فەسڵی یەکەم

## دیمەنی یەکەم

## شەقامێکی لەندەن

**(ریچارد، میری گلۆستەر ، بەتەنێ وەژوور دەکەوێ)**

***میر گلۆستەر:*** **ئەمێستا هەتاوی یورك، زستانی خەمەکانی کردوین بە تاوستانێکی شکۆدار. هەورو هەلاّی تاریکی سەر ماڵەکانی رەواندینەوەو لە ناخی بێ بنی ئۆقیانووسدا ناشتنی، ئەمێستا تاجەگوڵینەی سەرکەوتنمان لەسەر ناوە، کۆنە چەکەکانمان، بۆ جوانی و یادگاران بە دیوارانەوە هەڵدەواسین، هورای تورەی جەنگ و هێرشان باوی نەما، گۆڕا، بوو بە کۆڕ و بەزمی خۆشی و شادی، بوو بە رۆژی هەڵپەڕکێ و رەقسین و سەما.**

**رووی گرژ ومۆنی خواوەندی جەنگ گەشایەوە، چیتر ئەسپی زرێپۆش زین ناکا، تاو نادا، تا ترس و لەرز بخاتە دڵی دژمنانی ترساوەوە.**

**ئەوەتا سووك و گورج، لە ژووری مەحبوبەکەیدا، لەسەر نەزمی نەشئەبەخشی عودا، دەرەقسێ، بەلاّم منی نەبەکام، منی ناحەز، مەحروم لە ئەنگێزەی ئاشقێنی.**

**بۆ ئەوە نەخوڵقاوم لە ئاوێنەی حەبیبەیەکدا، تەماشای رووی خۆم بکەم، زاخاوی چاوانم بدەم، منی بەپەلە گوراو، بێبەش لە قۆزی ئاشقان، قۆزییەك لە بەردەم پەرییەکی هەوەسبازی، خۆش خەرامدا خۆی پێوە بادەم.**

**منی مەحروم لە جوانی،**

**منێ کە تەبیعەتی خاپینۆك شێواندوومی،**

**منی شێواوی نوقوستان، ناحەزو بەدچارە، کە بەر لە زەمانی خۆم، بە نەبەکامی توڕدراومەتە ئەم جیهانی پڕ جۆششی ژیانەوە.**

**کەکسۆکان سەرو فەساڵی دزێوو، وەهەیئەتی غەریب و عەنتیکەم دەبینن، پێم دەوەڕن، ئەرێ، من لەم وەختە کەم دەوامەدا، لەم کاتی ئاشتییەدا، کە دەنگەکان کپ و ناسك دەبنەوە، هیچ شادی و خۆشییەك نابینم، خۆمی پێ مژوڵ بکەم، مەگەر لەبەر تیشکی هەتاوا،**

**بە دزییەوە نیگای سێبەرەکەی خۆ بکەم،**

**گۆرانی بە شێوەی شێواوی خۆدا بڵێم،**
**جا مادامێکی بە کەڵکی خۆشەویستی و ڤیان نایەم،**
**ناتوانم لەزەت لەم رۆژە خۆش و جوانانە ببینم،**
**مەرجە شەڕانی بم!.**
**بوغزو کینەی خۆم بەسەر لەزەت و شادی ئەم رۆژانەدا بڕێژم، من پیلانی خۆم داناوە، و دەستم بە سەرەتا ترسناکەکانی کردووە، تا لە رێگەی پێشبینیانی بۆش و بەتاڵ، بوختان و ئیفترا، و خەونانەوە،**
**بوغزو کینەیەکی کوشندە بخەمە نێوان پاشاو کلارنسی برامەوە.**
**ئەگەر راست بێ، ئەدوارد شا، بە هەمان ئەندازە کە من فێڵبازو دوو روو و خیانەتکارم، راستگۆو دادپەروەر بێ، دەبێ کلارنس ئەمڕۆ دەزندان بخرێ، لەبەر ئەم پێشبینییەی کە: میراتگرانی پاشا بە دەستی کەسێك دەکوژرێن کە ناوەکەی بەپیتی (جیم) دەست پێدەکات.**
**ئەی هزرو بیران وەژوورکەون لە ناخی روحمدا مت بن!**
**ئەوا کلارنس بەرەو ئێرە دێ.**

***(کلارنس کە نیگابانان دەوریان داوە، دەگەڵ براکنبری دا وەژوور دەکەوێ).***

***بەیانیت باش برام، ئەم نیگابانە چەکدارانە کێن بە دەورتەوە؟***
***کلارنس:*** **خاوەن شکۆ، لەبەر سەلامەتی من، ئەم زێڕەڤانانەی داناوە تا بە سەلامەتی بمگەیەننە بورج.**
***میر گلۆستەر:*** **بۆچی؟**
***کلارنس:*** **چونکە نێوم جۆرجە.**
***میری گلۆستەر:*** **بەداخەوەم ئەزبەنی، باجی تاوانێك دەدەی دەستی تۆی تیا نیە.**
**دەبوایە سزای تەعمید کارەکەی دابای،**
**تۆ بڵێی خاوەن شکۆ لێبڕا بێ، لە بورجێ دا سەر لە نوێ تەعمید بکرێیتەوەو ناوێکی ترت لێ بنرێ؟**
**باشە کلارنس سڕی ئەم کارە چییە؟ پێم ناڵێی؟**
***کلارنس:*** **ریچارد، باوەڕ بکە تا ئێستا نایزانم.**
**کەی زانیم هەنگی پێتی دەڵێم،**
**ئەوەندەی من تێی بگەم، خاوەن شکۆ**
**باوەڕی بە پێشبینی و خەونان هەیەو لە نێو حەرفێن ئەلفبادا، حەرفێ جیمی هەڵبژاردووەو دەڵێت ژنێکی جادووگەر پێی راگەیاندووە کە (جیم) تەخت و تاجی پاشایەتی لە کوڕەکانی داگیر دەکات.**
**جا چونکە من جۆرجم ناوە، و ناوەکەم بە پیتی جیم دەست پێدەکات، بۆیە مەزەندەی هاتۆتە سەر ئەوەی کە ئەو پیاو کوژو داگیرکەرە من بم، وەکو بیستوومە ئەو پێشبینییە پوچ و قسە بێهودانە وایان لە خاوەن شکۆ کردووە کە هەواڵەی زیندان بکرێم.**

***میر گلۆستەر:*** سەیرە، ئەمە تەنیا زەمانێ روو دەدا کە ژنان حوکمی پیاوان بکەن.
کلارنس، ئەوەی ئێستا تۆ رەوانەی بورجێ دەکات خاوەن شکۆ نیە، (لیدی گرای) ژنیەتی، ئەو ئەم کارەی پێکردووە.
مەگەر هەر ئەو و برایەکەی، لورد ڤودڤیل، نەبوون کە لۆرد هیستینگزیان هەواڵەی زیندان کرد، کە تا ئەمڕۆ لە زیندان بەر بوو؟
ئێی کلارنس، ئێمە هیچ ئەمانێکمان نییە، ئەمانمان نییە.
***کلارنس:*** بە زاتی خودا من پێم وایە جگە لە کەسوکاری شابانۆ و ئەو پەیکە شەو گەڕانەی کە لە نێوان شاو (شور)ی ماشوقەی دا دێن و دەچن، کەس لە خۆی ئەمین نییە.
چما نەت بیستووە لورد هیستینگز چەندی لەبەر پاڕاوەتەوە، تا رەهای بکات؟
***میر گلۆستەر:*** جەنابی لورد، مەزنی رازگرەکانی من، هانای بۆحەزرەتی شابانۆ برد، داماوو ملکەچانە لەبەری پاڕایەوە تا ئازادی کرد، نازانم چ بڵێم، بەڕای من باشترین سیاسەت ئەمەیە ئەگەر بمانەوێ دڵی پاشا بە دەست بێنین، ببین بە پیاوی (شور) خانم و جلی نۆکەریی ئەو بپۆشین، چونکە ئەوو ئەو بێوەژنە حەسودە، ئیلیزابتی پیری دنیادیدە، (ئیلزابت بەر لەوەی شوو بکات بێوەژن بوو) گومان و دووزمانیان بە شیرەوە خواردووە،
لەو ساوە برایەکەمان رووی داونەتێ و ناز ناوی بانۆو خانەدانی داونەتێ،
کاروباری سەڵتەنەتەکەمان کەوتووەتە دەستی ئەوان، قسەی ئەوان رەتکردنەوەی نییە.
***بروکنبری:*** ببوورن سەروەرانم، داوای بوردن لە هەردووکتان دەکەم، خاوەن شکۆ فەرمانی داوە کە هیچ کەسێك، چەند گەورەش بێ، بۆی نییە قسەی تایبەتی دەگەڵ برایەکەتاندا بکات.
***گلۆستەر:*** بەڕاست! گرینگ نییە بروکنبری، ئەگەر حەز دەکەی وەرە بەشداری قسەکانمان بکەن کوڕی باش! خۆ ئێمە باسی خیانەت ناکەین، ئێمە دەڵێین خاوەن شکۆ پیاوێکی بە ئاوەزو زانایە، ژنەکەی، شابانۆی نەجیمزادەو خانەدان، هەر چەندە تەمەنی تەواو هەڵکشاوە، هێشتا هەر جوانە و هیچ غیرەو حەسودییەکی لا نییە، دەڵێین (شور) پێیەکانی جوانە، دەم و لێوی فستقە، نوقڵە، چاوانی جوانە، و زاری شیرینە، هەنگوینی لەزار دەڕژێ، و دەڵێین کەسوکاری شابانۆ هاتونە ریزی خانەدان و لۆردانەوە.. تۆ چ دەڵێی؟ دەتوانی بڵێی وانییە؟
***بروکنبری:*** قوربان، جەنابی لۆرد، من هەقم بەمەوە نیە.
***گلۆستەر:*** هەقت بەسەر بانۆ (شور)ـەوە نیە؟ جا کوڕی باش چاك بزانە، ئەگەر قەرار بێ کەسێك هەقی بەسەریەوە هەبێ، جگە لەیەك کەس، باشتر وایە بە نهێنی و بە تەنێ هەقی بەسەریەوە هەبێ.
***بروکنبری:*** ئەو یەك کەسە کێیە قوربان، جەنابی لۆرد؟
***میر گلۆستەر:*** مێردەکەی هەی زۆڵ! خۆ ناچی خەبەرم لێبدەی؟
***بروکنبری:*** قوربان، بمبورە تکایە چیتر دەگەڵ جەنابی میردا قسە مەکە.
***کلارنس:*** بروکنبری، ئێمە دەزانین چ ئەمرێکت پێکراوە، و بەو ئەمرە دەکەین.

***میرگلۆستەر***: ئێمە نۆکەری گوێڕایەڵی شابانۆین و فەرمانی دەخەینە سەر چاوان، بە دوعا براکەم! ئەوا من دەچم بۆ لای پاشا، هەر چیم لە دەست بێ و پێم بسپێرێ دەیکەم تا ئازادت بکەم، تەنانەت ئەگەر ناچاربم ئامادەم بە بێوەژنەکەی ئیدوارد بڵێم خوشکەکەم (بەپێی دابو نەریتی ئینگلیزی براژن هاوتای خوشکە بۆ شووبرا). بەڕاستی ئەم بێ لوتفیەی خاوەن شکۆ دەرهەق بە برایەتی کردویەتی، لەوە زیاترم ئەزیەت دەدا کە تۆ تەسەوری بکەی.

***کلارنس***: من دەزانم کە ئەم کارە نە بە دڵی تۆیەو نە بە دڵی من.

***میرگلۆستەر***: بە هەر حاڵ تۆ زۆر لە زیندانا نامێنییەوە، یا رزگارت دەکەم، یا منیش لەگەڵتا دێمە زیندان، بەڵام جارێ برێك سەبرت بێ.

***کلارنس***: چارم چیە، بە هومێدی دیدار.

***(کلارنس، بروکنبری و زێرەڤانەکان وەدەر دەکەون)***

***میرگلۆستەر***: بڕۆ ئەی کلارنسی سافیلکەی خۆشباوەڕ، بڕۆ ملی رێگەی نەگەڕانەوە بگرە، من هێندەم خۆش دەوێی، گەر خوا دەستم بداو بەم قوربانیانەی بەردەستی ئێمە رازی بێ، بەم زووانە روحت بۆ بەهەشت دەنێرم، ئەوە کێیە هێروە دێت؟ لورد هیستینگزە کە ئەمڕۆ لە زندان رەها بووە؟

***(لورد هیستینگز وەژوور دەکەوێ)***

***هیستینگز***: رۆژباش ئەی سەروەرم، جەنابی لۆردی دڵاوا!

***میرگلۆستەر***: رۆژباش لە خۆت ئەی مەزنی رازگرانی کۆشك و دەرباری من! ئازادیت لێ موبارەك، جەنابی پایە بەرزتان زندانتان چۆن لێ گوزەرا؟

***هیستینگز***: سەروەری نەجیب و موحتەرەمم، وەکو هەر زیندانیەك گوزەراندم، ئەزبەنی من بۆیە دەژیم، تا چاکەی ئەوانە بدەمەوە کە بە حەپسکردنیان دام.

***میرگلۆستەر***: بێگومان، بێگومان! کلارنس-یش هەمان کاری تۆ دەکات؟ دژمنەکانی دوێنێی تۆ ئەمڕۆ لەویان هەڵپێچاوە، بە هەمان شێوەی کە زەفەریان لە تۆ هێنا بوو، زەفەریان لەویش هێناوە.

***هیستینگز***: سەد حەیف و مەخابن، هەڵۆیان لە قەفەز بنرێن، و داڵاش و سیسارکە کەچەڵان ئازادانە بکەن راوێ.

***میرگلۆستەر***: خەبەرو باسی دەرێ چییە؟

***هیستینگز***: خەبەرو باسی دەرێ لە هی ناوخۆ خراترنین، پاشا نەخۆشە، لە شنگ و تاقەت کەوتووە، خەم و پەشێوی دایگرتووە، دکتۆرەکانی مەترسی مردنی لێدەکەن.

***میرگلۆستەر***: بەزاتی (سەنت پۆڵس) ئەمە خەبەرێکی زۆر خراپە! ماوەیەکی زۆرە دەستی داوەتە پارێز و رژێمێکی سەخت ، بەمە جەستەی شاهانەی خۆی تەواو چروساندووەتەوە. بەڕاستی مایەی داخە. هەنوکە لە کوێندەرە؟ لە جێدا کەوتووە؟

***هیستینگز***: بەڵێ، لە جێدا کەوتووە.

***میرگلۆستەر***: کەواتە تۆ لە پێش مندا بچۆ بۆ لای و منیش دوا بە دوای تۆ دێم.

*(هیستینگز وەدەر دەکەوێ)*

ئومێدم وایە نەژی، بەڵام نەشمرێ تا بەپەلە جورج دەنێرێتە بەهەشتێ. دەیسا فرسەتە با هەر ئێستا وەژوور بکەوم و بە درۆو دەلەسانی بەجێ و رێ هێندەی دی لە کلارنسی پڕ بکەم، ئەگەر ئەم نەخشەیەم سەر بگرێ عەمری درێژی کلارنس هەر ئەمڕۆ دەبێت، ئومێدەوارام دوای ئەوە خوا ئیدوارد شا بەرێتەوە بەر رەحمەت و دلۆڤانی خۆی، ئەم دنیایە بۆ جۆش و خرۆش و تەراتێنی من بە جێ بێڵێ. هەنگێ من کیژە چکۆڵەکەی (وریک) دەخوازم، ئیدی گرینگ نیە کە مێردەکەی و خەزوریم کوشتووە، ئاسانترین رێگە بۆ ئاشتکردنەوەی ئەوەیە کە هەم بۆی ببم بە مێرد و هەم ببم بە باب، من ئەم کارە دەکەم، نەك لەبەر خاتری ئەشق و ڤیان، بەڵکو لە رای ئامانجێکی نهێنی دیکەدا کە بە خواستنی ئەو دەتوانم بیگەمێ. بەڵام من تاکو ئێستا لە عەرەبانەیەك دەچم کە بیەوێ بەر لە ئەسپەکەی ژێری بگاتە بازاڕ، چونکە کلارنس هێشتا زندووە، لە ژیاندایە، ئیدوارد هێشتا زندووەو حوکمڕانی دەکات، باشتر وایە کەی ئەوان نەمان، هەنگێ من حەساوی قازانجەکانی خۆم بکەم

*(وەردەر دەکەوێ).*

## دیمەنی دووەم

## لەندەن، شەقامێکی دیکە

**( جەنازەکەی هنری-ی شای شەشەم لە تابوتێکی کراوەدا دەهێنرێتە سەر شانۆو زێڕەڤانانی نێزە بەشان نیگابانی دەکەن. لیدی ئان رەشپۆشە تریسلی و بوکلی پاسەوانی دەکەن ).**

***ئان***: داینەن، بارە پڕ فەڕو شکۆدارەکەتان لە عاردی دابنەن، ئەگەر فەڕو شکۆ لە کفندا جێی ببێتەوە، لە عاردی دای بنەن تا من تاوێك بەسەریا لە سەلأی گریان بدەم، بۆ هەرەس و مەرگی ناوادەی خانەدانی سەربەرزی لانگستەر ماتەم بگێرم، ئەی جەنازەی ساردەوەبووی پاشای پیرۆز، ئەی خۆڵەکەوەی خەمینی سەر سەراو خانەدانی لانگستەر، ئەی پاشماوەی خوێنی پاشایەتی، چی بووە،بۆچی خوێنی ژیانت لەبەر بڕا!

لێم مەگرە، با روحت گاز بکەمە ئێرە، تا گویٚ لە ناڵەو فیغانی (ئان)ی بێچارە و کڵۆڵ رادێریٚ، ئان–ی هاوسەری ئیدواردی کوڕت، کوڕە کوژراوەکەت..

کوژراو بە هەمان ئەم دەستەی کە شەبەقی ئەم هەموو زامەی کردووەتە جەستەی تو!

بڕوانە، ئەوەتا من هەتوانی بیٚ توانی چاوانی ماندووم، دەڕێژمە ئەو شەبەقی زامانەوە کە گیانی تۆی لێوە دەرچوو، دەیسا نەفرەت لەو دەستەی ئەو شەبەقانەی کردە جەستەی تۆ! نەفرەت لەو دڵەی کە دڵی هات ئەم کارە بکات! نەفرەت لەو خوێنەی کە خوێنی تۆی رشت! ئۆه خودایە چارەنووسی ئەو پیاوە بیٚ وێژدانە، ئەو کەللەشەقە بودەڵەیەی کە بە مەرگی تۆ داخی کردین، بە مەرگی تۆ بەدبەختی کردین، بەو چارەنووسە بیٚ کە بۆ گورگانی دەخوازم، بۆ حەزیایان، جاڵجاڵۆکەو بۆقان و بۆ هەموو خشۆکێکی ژاراوی سەرزەمینی دەخوازم، تەمەنا دەکەم گەر قەدەر کوڕی دایە، خودایە بە شێواوی لەبار بچیٚ، بە نەبەکامی لە دایك بیٚ، دەعبایەکی هێندە ناشیرین و غەریب بیٚ، دایکە ئومێدەوارە کەی هەترەشی لێی بچیٚ، ئومێد دەکەم ببیٚ بە میراتگری نەگبەتیەکانی بابی، تەمەنا دەکەم ئەگەر قەدەر وای هانی ژن بێنیٚ، چەند مەرگی تۆو مردنی مێردە لاوەکەم منیان خەمبار کردووە، ژنەکەی بە مەرگی ئەو سەد هێندەی من خەمی بەسەرا بباریٚ. دەیسا ئێستا وەرن، بارە پیرۆزەکەتان هەڵگرن، ئەو بارەی لە کلێسای پۆڵسی موبارەکەوە هانیتان، هەڵیگرن و رووبکەنە (چرتسی) تا لەوێندەر بەخاکی بسپێرن. ئەگەر ماندوون تۆزێکی دیکەش بحەسێنەوە، تا منیش تاوێکی دی جەنازەکەی هنری شا بلاوێنمەوە.

***(گلۆستەر وەژوور دەکەویٚ)***

***گلۆستەر***: ئەی جەنازە هەڵگران بوەستن، ئەو تابوتە دانەنە سەر زەوی.

***ئان:*** چ جادووگەرێك–ی بەدكار ئەم شەیتانەی نارد، تا ریَ لە كارە موبارەك و خێرخوازانەكانمان بگریَ؟

***میرگلۆستەر:*** لەگەڵ ئێوەمە خوێریانە، دەنا قەسەم بە زاتی پۆڵسی موبارەك ئەوەی لە قسەم دەرچیَ، چاوی سپی دەكەم!

***زێرەڤانێك لە نێزە بە شانەكان:*** گەورەم، لاكەوەو رێی جەنازەكە بەردە.

***میرگلۆستەر:*** هەی سەگی خوێری، بیَ ئەدەب! كە من ئەمرم كرد- تۆ بوەستە! لاكەوە، ئەو نێزەیەشت لە سینگم دوورخەوە، دەنا قەسەم بە پۆڵسی موبارەك دەتخەمە بن پێیان و لەسەر ئەم بیَ ئەدەبیەت بۆ حەفتا بابت تەمبێت دەكەم هەی سواڵكەری هەتیوچە،

ئان: ئەوە چیە، دەلەرزن؟ ترس قەڵەمی دەست و پێی شكاندوون؟ ئەفسوس. بەڵام لۆمەتان ناكەم، نە هەقتان نیە، چونكە ئێوە هەمووتان بە شەری فانین، چاوانی بەشەر توانای دیتنی شەیتانی نییە، شەڕمان لیَ لادە ئەی زێوانی ترسناكی دۆزەخ! ئەی پەیامنێری سامناكی دۆزەخ! تۆ مەگەر دەسەڵاتت تەنیا بەسەر جەستەكەیدا هەبیَ، مەحاڵە بگەیتە رۆحی بۆیە لاكەوە، لاكەوە!

***مێرگلۆستەر:*** ئەی فریشتەی جوان، بیكە بە خاتری پاكی خۆت، ئەوەندە توڕە مەبە.

***ئان:*** ئەی شەیتانی بەدكردەوە بۆ خاتری خوا بڕۆ، شەڕمان لیَ لادە، تۆ سەر زەمینی بەختەوەریت كردووە بە دۆزەخی خۆت و پڕت كردووە لە هاواری نەفرەت و ئاهوناڵەی زامار، ئەگەر حەز دەكەی نموونەیەكی تاوانەكانت بە چاوانی خۆت بدینی، بڕوانە ئەو جەنازەیە، بەڕێزان بڕوانن! تەمەشاكەن، وا زامی جەنازەكەی هنری، دەكوڵێنەوە، سەر لە نویَ خوێنیان لەبەر دەڕوات. هەر خۆت بە خۆت بی ئەی تۆپەڵە گڵاوی و بەدكاری، بە ئامادەبوونی تۆ خوێن زایەوە دەمارە ساردو هیشكەكانی. كرداره نامرۆڤانی و سەیرەكانی تۆیە كە ئەم لافاوە هەرە سەیرەی هەڵكردووە. ئەی خودایە، ئەی ئەو كەسەی ئەم خوێنەت دروست كردووە، تۆڵەی مەرگی بسێنە!

تۆش ئەی خاك، ئەی ئەو كەسەی ئەم خوێنانە هەڵدەمژی، تۆڵەی بستێنە،

ئەی ئاسمان هەورە بروسكەی لێبدە،

ئەی زەوی بقڵەشیَ و بە زندوویەتی قووتی بدە!

وەكو چۆن خوێنی ئەو پاشا دڵاوایە هەڵدەمژی،

ئەو پاشایەی كە بەو دەستە تاوانبارانە كوژراوە.

***گلۆستەر:*** خانمەكەم، تۆ هیچ شتێك دەربارەی یاساو رێسای رەحمەت و دلۆڤانی نازانیت، ئەو یاسایەی كە جەزای شەڕ بەخێر، و پاداشتی نەفرەت بە رەحمەت دەداتەوە.

***ئان:*** ئەی بەدكار، ئەی شەیتانی شەڕانی، تۆ نە یاسای خودا دەناسیت و نە یاسای ئینسانی، هیچ حەیوانیَ، چەند دڕندەو شڕندە بیَ، بە هەموو دڕندەییەكی خۆیەوە دڵی لە بەزەیی و دلۆڤانی خاڵی نییە.

***گلۆستەر:*** بەڵام دڵی من هیچ بەزەییەكی تێدا نییە، كەواتە من حەیوان نیم.

***ئان:*** سەیر ئەوەیە شەیتانان باسی هەق بكەن!

***گلۆستەر***: لەوە سەیرتر، ئەمەیە فریشتان تووڕە بن، تۆزێ دڵت نەرم بێ ئەی خانمەکەم، ئەی نموونەو نیشانەی کەماڵی خوایی، ئەی فریشتە ڕێم بدە، فرسەتم بدەیە، با بە بەڵگەوە پاکانەی خۆمت بۆ بکەم، و خۆم لەو تاوانە هەڵبەستراوانە پاك بکەمەوە.

***ئان***: تۆ دڵت نەرم بێ، ئەی دزێوی بەد فەسالْ، تۆ ڕێگەی من بدە با بەڵگەوە تاوانە زەقەکانت بە ڕوودا بدەمەوە.

***گلۆستەر***: ئەی جوانی جوانان، ئەی ئەو کەسەی، زمان لە وەسفی جوانیا کۆڵە، کەمۆکەیەك سەبرم لێ بگەرە، فرەسەتم بدە با پاکانەی خۆم بکەم، پۆزشت بۆ بێنمەوە.

***ئان***: ئەی بەدکار، ئەی چەپەڵتر لەوەی دڵ بتوانێ پەی بە تاوان و گلاویەکانی بەرێت، تۆ ناتوانی هیچ پاکانەیەك بهێنیتەوە، شا پاکانەی تۆ ئەوەیە خۆت لە دار بدەی.

***گلۆستەر***: دەتەوێ بەو جۆرە، بەو نائومێدیە، تاوانەکە بەسەر خۆدا ساغ بکەمەوە، خۆم مەحکوم بکەم؟

***ئان***: هەر ئەو نائومێدییە دادت دەدا، بەو کارە دەتوانی تۆڵەیەکی بەجێ و شایستە لە خۆت بکەیەوە، تۆڵەی کوشتنی ئەو کەسانەی شایەنی کوشتن نەبوون.

***گلۆستەر***: ئەدی ئەگەر من نەم کوشتبن؟

***ئان***: ئەگەر وابێ مانای وایە نەمردوون، بەلاّم ئەوان مردوون، کوژراون و بڕاوەتەوە، بە دەستی تۆ، تۆی بەندەی بەدفەڕی شەیتان سیفەت.

***گلۆستەر***: بەلاّم من مێردی تۆم نەکوشتووە.

***ئان***: عەجەب، کەواتە زندووە، نەمردووە.

***گلۆستەر***: نەخێر، مردووە، بە دەستی ئیدوارد کوژراوە.

***ئان***: زاری گلاّوت لێکنێ، تۆ درۆ دەکەی، شابانۆ مارگرێت بە چاوی خۆی شمشێرەکەتی بینی بوو کە خوێنی ئەوی لێدەچۆڕا، هەمان ئەو شمشێرەی کە جارێك ئاراستەی سەر سینگی ئەوت کردبوو، بەلاّم براکانت فریای کەوتبوون، دەنا ئەویشت دەکوشت.

***گلۆستەر***: زمانی خۆی نەدەگرت، ئەو زمانە پیسەی کە تاوانی براکانمی دەخستە ئەستۆی بێ گوناحی من، ئەو زمانە بۆ ئەو کارەی هاندام.

***ئان***: نەخێر، حەزو تاسەی خوێن ڕێژی، مێشکی ئاشقە خوێنت، بۆ ئەم کارەی هاندایت، ئەو مێشکەی جگە لە تاوان و خیانەت هیچ خەونێکی دیکەی نەدیتوە، گوایە تۆ ئەم پاشایەت نەکوشتووە؟

***گلۆستەر***: لەم بارەیەوە هەقت دەدەمێ.

***ئان***: هەقم دەدەیتێ هەی بێ شەرەف؟ کەواتە با خواش هەقم بداتێ و تۆ لەبەر ئەم بەدکارییەت، ئەم کردەوە چەپەڵەت بەنەفرەت بکەم، سەد حەیف و مەخابن بۆ ئەو پیاوە، بەراستی پیاوێکی نەجیب و بە ڕەوشت و میهرەبان بوو.

***گلۆستەر***: لەبەر ئەمە باشترین شوێن بۆ پاشا بەهەشت بوو، کە ئێستا پێی گەییوە.

ئان: ئەو ئێستا لەو بەهەشتەیەدا، کە تۆ هەرگیز دوو پێی تێ نانەی.

***گلۆستەر:*** کەواتە با مەمنونی من بێ، کە یارمەتیم داو بۆ ئەوێندەرم نارد، چونکە ئەوێ بۆ ئەو شایستەتر و باشتر بوو لە زەوی.

***ئان:*** بەڵام تۆ تەنیا بۆ دۆزەخ باشی.

***گلۆستەر:*** نەخێر، بۆ شوێنێکی دیکە باشم، ئەگەر تۆ ڕێم بدەی بیڵێم.

***ئان:*** بۆ زیندانێکی تاریك و نوتەك.

***گلۆستەر:*** نەخێر، بۆ ناو جێگەکەی تۆ.

***ئان:*** بێخەوی ڕوو بکاتە ئەو ژوورەی تۆی تیا دەنووی.

***گلۆستەر:*** دەم خۆش خانمەکەم، تا لەگەڵ تۆدا بخەوم.

***ئان:*** هیوادارم وابێ *.

***گلۆستەر:*** دەزانم، بەڵام ئەی خانمە ناسکۆڵەکە، ئەی لیدی ئانی نەجیب، با واز لەم شەڕە دەم و تانەو تەشەرانە بێنین، و هێدی ترو جدی تر قسان بکەین، باشە سەبەبکاری مەرگی ناوادەی ئەم وەچانەی ماڵباتی پلانتاجیت، مەرگی هنری و ئیدوارد، بە ئەندازەی بکوژەکەیان شایستەی سەرزەنشت و گازاندە نیە؟

***ئان:*** تۆ هەم سەبەبکار و هەم بکوژە شوومەکەشی.

***گلۆستەر:*** جوانی تۆ ئەمەی پێکردم، شەو نەبوو خەون بە جوانی تۆوە نەبینم، جوانیەکەی تۆ وای لێکردم، لە پێناوی تاقە سەعاتێکی باوەشی پڕ لەزەتی تۆدا، هەموو خەڵکی بکوژم.

***ئان:*** بەڵام دڵنیایە، ئەی جەلاد، ئەگەر بەو جۆرە بیرم بکردایەتەوە، بەم نینوکانە، جوانی گۆناکانم لە ریشەوە دەردێناو گۆناکانم دەڵدەدڕی.

***گلۆستەر:*** نا، نەکەی، چونکە چاوانی من تەحەمولی دیتنی وێرانەی ئەو جوانیە دڵگیرە ناکەن، نابێ بە بەرچاوی منەوە ئەوە جوانیە لەکەدار بکەی، وەکو چۆن هەموو خەڵکی کەیفیان بە پرشنگی هەتاو دێ، منیش کەیفم بە جوانی تۆ دێ. جوانی تۆ خۆری منە، ژیانی منە.

***ئان:*** دەی سا هەموو ڕۆژێکت هەر شەوو تاریك بێ، و هەموو ژیانت هەر مەرگ و مردن بێ.

***گلۆستەر:*** تووك و نەفرەت لە خۆ مەکە ئەی ئافەریدەی نەشیمل! چونکە تۆ هەردووکیانی، هەم ڕۆژی و هەم شەوی.

***ئان:*** بریا وا بووام تا تۆڵەم لێدەکردیتەوە.

***گلۆستەر:*** بە ڕاستی دژمنایەتیەکی سەیرە، وەرە بتەوێ تۆڵە لە کەسێك بکەیەوە کە خۆشی بوێی.

***ئان:*** دژمنایەتیەکی ڕەواو لوجیکیە کە تۆڵە لە کەسێك بستێنم کە مێردەکەی کوشتووم.

***گلۆستەر:*** خانمەکەم، بکوژی مێردەکەت، بۆیە ئەو کارەی کرد، تا یارمەتیت بدات کە مێردێکی باشتر بدۆزییەوە.

***ئان:*** لە نێو زندوواندا هیچ مێردێکی لەو باشتر نییە

---

* لێرەدا مەبەستی ( لیدی ئان ) خەوی مەرگ و ڕاست نەبوونەوەیە، مەبەستی گلۆستەر خەوی ڕابواردن و هاوباخەڵییە.

***گلۆستەر***: با، لەو زیاتری خۆش دەوێی، لە نێو زندووانەو لە ژیاندایە.

***ئان***: کێیە؟ نێوی بڵێ.

***گلۆستەر***: پلانتاجیت.

***ئان***: ئەویش پلانتاجیت بوو.

***گلۆستەر***: بە هەمان ناو ناسراوە، بەڵام ئەمیان لە قوماشێکی باشترە.

***ئان***: لە کوێیە؟

***گلۆستەر***: لێرەیە! (ئان تفێك دەکاتە چارەی گلۆستەر) بۆچی تفم لێدەکەی؟

***ئان***: بریا ئەم تفەم دەبوو بە ژەهرێکی کوشندە و لە کۆڵی دەکردیتەوە.

***گلۆستەر***: هەرگیز ژەهر لە شوێنی وا شیرینەوە نەڕژاوە.

***ئان***: بەسەر بۆقێکی لە تۆ دزێوترا نەڕژاوە! گوم بە لەبەر چاوم! تۆ چاوانم دەلەوتێنی.

***گلۆستەر***: بەڵام سیحری چاوانی تۆ ئەی خانمە جوانەکەم، چاوانی بە خەمیشیان ئەفسوون کردووم.

***ئان***: بریا چاوەکانم، دوو چاوی ژەهراوی ئەژدیهایەك دەبوون، تا بە سیحری خۆیان دەیانکوشتیت:

***گلۆستەر***: خۆزیا وا دەبوون، تا من دەم و دەست دەمردم، چاوانی تۆ ئەمێستا ژیانیان لێ حەرام کردووم، ئەمێستا زندە بە کوژم دەکەن چاوانت فرمێسکی سوێریان لە چاوانم هێناوە، میناکی منالان هێندەم فرمێسك هەڵڕشتووە پێڵوەکانم سووتاونەتەوە.

ئەم چاوانەی هەرگیز فرمێسکی پەشیمانی و بەزەییان نەڕشتووە.

تەنانەت ئەو دەمەش کە بابم، یورك و ئیدوارد، گوێیان لە نالەی بە سوێی رۆتلاند بوو، —لەو کاتەدا کە (کلیفورد)ی رەزا قورس بەر شمشێرانی دا، هەنگێش فرمێسکیان لێ نەهات، تەنانەت کاتێ بابە نەبەزەکەی تۆ، چیرۆکی پڕ سوێی کوژرانی بابی منی گێڕایەوە، بیست جاران قسەکەی خۆی بڕی تا، وەکو مندالان بگری و لە هۆڕژنی گریانێ بدا.

وەختێ ئامادەبووان، گوێیان لێ بوو، فرمێسکیان وەکو هەوری بوهارێ داباری و روومەتیان تەڕ تەڕ بوو، وەکو چۆن باران گەڵای درەختان تەڕ دەکات، روومەتیان لە فرمێسکا هەڵکشا، ئا لەو کاتە پڕ خەمەشدا تاقە فرمێسکێك لە چاوانم نەهات

کە زیللەت و داماوی بنوێنێ.

بەڵام چی بکەم جوانی تۆ لەو هەموو خەمە بەهێز تر بوو، ئەوەی ئەو هەموو خەمە نەیتوانی پێم بکات، جوانی تۆ پێی کردم، هێندە گریام چاوانم لێڵ بوو. من کە هەرگیز نە لە دۆست و نە لە دوژمن نە پاڕاومەتەوە، هەرگیز قسەی خۆش و نەرم نەزانیوە، بەڵام وا جوانی تۆ زمانی پژاندم و هێناومیەتە قسان، دڵەی سەرکێشم زمانم هاندەدا و لێی دەپاڕێتەوە کە بێتەگۆ.

***(ئان، بە قێزەوە تەمەشای گلۆستەر دەکات)***

لێوەکانت فێری ئەمجۆرە قێزو بێزە مەکە، چونکە بۆ ماچ و راموسان خوڵقاون نەك بۆ ئەم قێزو بێزە. ئەگەر دڵەی تۆڵەخوازت ناهێورێ و ناتوانی بمبوری، فەرموو من ئەم شمشێرە بڕندەیەت

دەدەمیٚ، تا لە دڵە دڵسۆزەکەمی ڕاکەی، و روحی منی پیٚ ڕەها بکەی، ئەو روحەی دەتپەرستیٚ، من سینگی خۆمت بۆ والاّ دەکەم، لیٚت دەپاڕیٚمەوە، بۆت دیٚمە سەر چۆکان تا بمکوژی.

*(سینگی بۆ والاّ دەکات، ئان نووکی شمشیٚرەکەی تیٚ دەکات)*.

نا، سڵ مەکە، دەست مەپاریٚزە! چونکە من هنری شام کوشت، بەلاّم جوانی تۆ ئەمەی پیٚکردم.

سادەی پەلەکە! چونکە من ئیدواردی لاوم کوشت، بەلاّم روخساری نورانی تۆ ئەمەی پیٚکردم.

*(شمشیٚرە کە لە دەستی ئان دەکەویٚ)*.

دەی شمشیٚرەکە هەڵگرەوە... یا میٚردم پیٚ بکە.

***ئان:*** هەستە، ئەی درۆزنی دوو ڕوو، هەر چەندە مەرگت بە ئاواتەخوازم، بەلاّم دەستی خۆم بە تۆ پیس ناکەم.

***گلۆستەر:*** کەواتە فەرمان بدە باخۆم بکوژم. فەرمانت دەخەمە سەر سەر.

***ئان:*** پیٚشتر فەرمانم پیٚ کردوویت.

***گلۆستەر:*** ئەوە لە دەمی توڕەییتا بوو. جاریٚکی تر دووبارەی بکەوە. هەنگیٚ ئەم دەستەی کە لە پیٚناوی ئەشقی تۆدا خۆشەویستی تۆی کوشت، ئەمیٚستا لەڕای ئەشقی تودا، خۆشەویستیٚکی واقیعی تر، راستگۆ تر دەکوژیٚت. ئیدی تۆ دەبی بە شەریکی تاوانی هەردوو کوشتنەکە.

***ئان:*** بریا دەمزانی چت لە دڵدایە.

***گلۆستەر:*** ویٚنەی دڵم لەسەر زمانمە،

***ئان:*** دەترسم هەردووکیان درۆزن و قەڵب بن.

***گلۆستەر:*** ئەگەر وابیٚ، تاقە زمانیٚکی راستگۆ لەسەر رووی زەوی پەیدا نابیٚ.

***ئان:*** بەسە، بەسە، شمشیٚرەکەت. بخەوە کیٚلاّن.

***گلۆستەر:*** کەواتە بڵیٚ ئاشت بووینەوە.

***ئان:*** دوایی ئەمەت بۆ دەردەکەویٚ.

***گلۆستەر:*** یانی بە هیوابم؟

***ئان:*** وابزانم هەموو پیاوان هەر بە هیوا دەژین.

***گلۆستەر:*** لوتفیٚکت بیٚ و ئەم موستیلەیە لە پەنجەت بکە.

***ئان:*** وەرگرتن نیشانەی قەبوڵکردن نیە. وەرگرتن ناکاتە بەخشین. (موستیلەکە لە قامکی دەکات)

***گلۆستەر:*** بڕوانە چۆن ئەم موستیلەیە لە قامکت ئالاّوە، هەر دەڵیٚی سینەتەو لە دڵەی بەستەزمانی من ئالاّوە. هەردووکیان ماڵی خۆتن، بیان بە. ئەگەر ڕیٚی بەندەو فیداکاری خۆت بدەی، لەبەر بارەگای میهری تۆدا بیٚتە چۆکان و داوایەکت لیٚبکات، بۆ هەمیشە شادومنەتباری دەکەی.

***ئان:*** داواکەت چیە؟

***گلۆستەر:*** داواکەم ئەمەیە بە باری زەحمەت نەبیٚ واز لەم ئەرکە خەمناکەت بیٚنە، بەو کەسەی بسپیٚرە کە لە تۆ پتر موستەحەقی خەم و تازیەباریە، و یەکسەر بۆ کۆشکی (کروسپی) بگەڕیٚوە، منیش پاش ئەوەی ئەم پاشا نەجیبەم بەوپەڕی ڕیٚزو حورمەتەوە لە دیٚری (چرتسی) ناشت و

گۆڕەکەیم بە فرمێسکی پەشیمانی ئاودا، بەزووترین کات دێم بۆ ئەوێندەرو بەڕێزو حورمەتەوە تۆ دەبینم. جا تکات لێدەکەم ئەو لوتفەم دەرهەق. بکە ئەگەر چی هۆیە نهێنییەکانی نازانیٚ.

***ئان***: زۆر باشە، منیش زۆر شادم کە دەتبینم بەم جۆرە پەشیمانیت. (تریسلی)و (بیرکلی) دوام کەون.

***گلۆستەر***: خوا حافیزیم لیٚ بکە.

***ئان***: تۆ شایەنی خواحافیزی نیت، بەڵام کە ئەوەندەم لەبەر دەپاڕێیتەوە و حەز دەکەی مجامەلەت بکەم وای دابنیٚ خوا حافیزیم لێکردویت. ***(ئان وەدەرکەویٚ، تریسلی و بیرکلی دووی دەکەون).***

***گلۆستەر***: بەڕێزان جەنازەکە هەڵگرن و بەرەو چرتسی بڕۆن

***یەکێك لە نێزە بەشانەکان:*** بەرەو چرتسی جەنابی لۆرد؟

***گلۆستەر***: نەخێر، بەرەو (هوایت فرایزر) و لە وێندەر چاوەڕوانی من بکەن.

***(جەنازەکە هەڵدەگرن و دەڕۆن، جگە لە گلۆستەر هەموو وەدەردەکەون)***

ئەریٚ کەس تائێستا دیویە بەمجۆرە ئاشقێنی دەگەڵ ژنێك دا کرابیٚ؟ کەس تائێستا دیویە پیاوێك بەمجۆرە ژنێك بە دەست بێنیٚ؟ نا، دەیگەمیٚ، بەڵام زۆری ناهێڵمەوە.

چی! ئایا دەشێت –منی بکوژی دەزگیرانەکەی، بکوژی بابی– بەو هەموو ڕقەوە کە لە دڵی خۆیدا لێی هەڵگرتووم، بیگەمیٚ؟

ئایا دەشێت بەو هەموو نەفرەتەی سەرزاری، بەو هەموو فرمێسکە قەتیسماوەی ناو چاوەکانی، کە شایەتی بوغزوکینەی ئەون لە من، بیگەمیٚ؟ ئایا دەشێت بەو هەموو کۆسپ و لە مپەرانەوە– خۆی، خوا، و ویژدانی– کە لە نێوان من و ئەودان، بیگەمیٚ؟ لە کاتێکا من هیچ پشتیوانێکم نیە تا دڵی بە دەست بێنم تەنیا شەیتانێکی بەدفەساڵی تەنیاو نۆڕینی ریاکارانە نەبیٚ– لە کاتێکا هەر هەموو زروفەکان دژی منن، ئایا بەو حاڵەشەوە دەیگەمیٚ؟ سەیرە! تۆ بڵێی ئیدواردی بیر چووبێتەوە، ئەو شازادە ڕەشیدەی مێردی، کە سیٚ مانگیٚ لە مەوبەر، لە توکسبری دا، لە جەرگەی تورە بوونێکادا، بەخەنجەران دامدروو کوشتم؟ ئەو پیاوە ڕەزا سووکە جوان خاسە، قۆزەی کە جارێکی دیکە دنیای بەرین ناتوانیٚ هاوتای ئەو بخاتەوە، ئەو پیاوەی کە تەبیعەت هەموو بەهرەیەکی پیٚ بەخشی بوو لە: گەنجی و جوامێری، ژیری و خەسڵەتێن رەسەنی پاشایەتی؟

ئایا لیدی ئان پاش ئەو هەموو کارەساتە دەتوانیٚ نیگای خۆی بە دیمەنی من بلەوتێنیٚ، منیٚ کە گوڵی لاوی ئەم شازادە قۆزەم لە تافی جوانیا هەڵوەراند، منیٚ کە ئەمم کرد بە بێوەژنێکی هاودەمی نوێنێکی خەمناك؟ منیٚ کە بە نیوەی ئیدوارد نابم؟ منیٚ کە میرایەتیەکەم پولێکی قەڵب نایەنیٚ؟ تۆ بڵێی دڵی بە منی شەل و شیت دابکەویٚ؟

بەڵام پێدەچیت من بە درێژایی ئەم ماوەیە بە ناهەق و زیاد لە پێویست خۆم بە کەم زانی بیٚ.. دەیسا گرێو دەکەم کە ئەو بە پیاوێکی ماقول و جوانم دەزانیٚ، ئەگەر چی من خۆم بەو جۆرە نابینم.

کەواتە قیرسیا دەکەم و ئاوێنەیەك دەکڕم، چەندین خەیات و بەرگ دور دێنمە خزمەتی خۆم، تا جوانترین جل و بەرگی پڕ بە بەری خۆمم بۆ بدورن.
جا مادامێکی هەنووکە تا ڕادەیەك متمانەو ئومێدم بە رواڵەتی خۆم پەیدا کردووە، با کەمێك دەست بکەمەوە و نرخی ئەم ئومیدەواری و متمانەیە بدەم و بی پارێزم. بەڵام دەبێ جارێ ئەم کابرایە لە چاڵ بنەم، ئەوجا بە گریانەوە بۆ لای خۆشەویستەکەم دەگەڕێمەوە. ئەی هەتاوی جوان هەڵێ. تا ئەو کاتەی ئاوێنەیەك دەکڕم، بۆ ئەوەی بەدەم ڕێکردنەوە وێنەی خۆمی تیا بدینم.

*(وەدەر دەکەوێ).*

## دیمەنی سێیەم

## لەندەن. کۆشك

( شابانۆ ئەلیزابت و هەردووك لۆرد ریڤەرز و گرای وەژوور دەکەون )

***ریڤەرز***: تۆزێ ئارامت بێ خانمەکەم، بێگومان خاوەنشکۆ بە زوویی چاك دەبێتەوەو عەلەمی نامینێ.

***گرای***: پەژارەو خەمباری تۆ هێندەی دی باری گران دەکات، توبی ئەو خوایە دڵخۆشی بدەوە، و بەزاری خەندان و چاوانی رۆشنەوە بچۆ دیاری تا کەیف و شادی لە دڵ و دەروونی خاوەنشکۆ بگەڕێ.

***شابانۆئەلیزابت***: باشە ئەگەر ئەو بمرێ، من چارم چییە؟

***گرای***: هیچ زیانێکت ناگاتێ، تەنیا لە دەست چوونی ئەو مێردە شکۆدارە نەبێ.

***شابانۆ***: لە دەستدانی ئەو پیاوە لە هەموو زیانێ گەورەترە.

***گرای***: خوا کوڕێکی وەچاخزادەی داوێتێ کە پاش مردنی مێردەکەت، سوکنایی بەخشت بێ.

***شابانۆ***: ئاە، هێشتا منداڵە، و سەرپەرشتیی ئەو بە (ریچارد گلۆستەر) سپێردراوە، گلۆستەریش نە منی خۆش دەوێ و نە هیچ یەکێك لە ئێوە.

***ریڤەرز***: جا قەراری تەواوەتی دراوە کە گلۆستەر ببێ بەسەر وەسێت و سەرکاری پاشایەتی؟

***شابانۆ***: هەر چەندە قەراری فەرمی نەدراوە، بەڵام بە نیازین ئەمە بکەین، چونکە ئەگەر پاشا پێشهاتیکی بەسەر بێ، دەبێ ئەم کارە بکرێ.

***(بکینگهام و ستانلی، شەریف داربی وەژوور دەکەون).***

***گرای***: ئەوا (لورد بکینگهام) و (لورد داربی) تەشریفیان هێنا.

***بکینگهام***: رۆژباش جەنابی شابانۆ

***ستانلی***: خوا شابانۆ راوەستاو بکات و وەکو هەمیشە شادو دڵخۆشی بکات.

***شابانۆ***: لۆرد داربی ئازیز، هەر چەند دۆتمیر (ریچموند)ی خێزانت، زەحمەتە بە دوعای خێری تۆ بڵێ ئامین، بەڵام لورد داربی ئازیزی من، هەر چەندە ئەو ژنی تۆیە و من ناحوبێنێ، بەڵام باوەڕ بکە من لەبەر لوتبەرزی و قسە رەقی ئەو، هیچ رقێکم لە تۆ هەڵنەگرتووە.

***ستانلی (داربی):*** تکات لێ دەکەم کە باوەڕ بە بوختاچی و درۆزنان مەکە، چونکە بەغیلی پێدەبەن، بوختانی بۆ دەکەن، درۆیانی بەزارەوە هەڵدەبەستن، گریمان ئەو قسانەی لەزاری ئەوەوە پێت گەیوونەتەوە راستن، بەڵام تۆ چاوپۆشی لێبکە، ببورە، چونکە ئەمە زادەی نەخۆشییەکەیەتی کە مجێزی دەشێوێنێ، ئەمە زادەی بەدکارییەکی خۆڕسك و رەسەنی ناخی نییە.

***ریڤەرز***: جەنابی لۆرد داربی، ئەمڕۆ خاوەنشکۆت بینی؟

***ستانلی***: من و جەنابی میر بکینگهام ئێستا لای خاوەنشکۆوە دێین.
***شابانۆ***: تا چەند ئومێدی چا بوونەوەی ئەوتان هەیە؟
***بکینگهام***: ئومێدمان زۆرە خانمەکەم، خاوەنشکۆ زۆر بە رووخۆشییەوە قسان دەکات.
***شابانۆ***: خوا شیفای بۆ بنێرێ، قسەتان لەگەڵی کرد؟
***بکینگهام***: بەڵێ خانمەکەم، حەزی لێیە میر گلۆستەر و براکانی تۆ ئاشت بکاتەوە، براکانی تۆو جەنابی لۆرد، گەورە رازگری دەربار ئاشت بکاتەوە، ناردوویەتی بە شوێنیانا کە بچنە خزمەتی.
***شابانۆئەلیزابت :*** خۆزگە وادەبوو... بەڵام زۆر زەحمەتە، دەترسم شادیمان گەیی بێتە لوتکە و لە نشێوبوونەوەدا بێ.
***(میرگلۆستەر و هیستینگز و دورست وەژوور دەکەون).***
***گلۆستەر***: بەڕاستی ئەوانە زوڵم لێدەکەن و منیش ئەم زوڵمەم پێ قەبوڵ ناکرێ. ئەوانە کێن کە سکاڵا دەبەنە لای پاشا و دەڵێن گوایە من کابرایەکی توڕەو تڕۆو سەختگیرم و ئەوانم خۆش ناوێ؟ ساقە قەسەم بەزاتی پۆڵسی موبارەك ئەوانە بە ئاستەم خاوەنشکۆیان خۆشدەوێ، و بەو درۆو دەلەسانە گوێی دەئاخنن و دڵان لێکدی دەڕەنجێن.
جا هەر لەبەر ئەوەی من ناتوانم زمانلوسی بکەم، ریابێژی بکەم. بە دەم خەڵکییەوە پێبکەنم، درۆ و دەلەسان بکەم، فڕو فێڵان بکەم، تەڵەکەبازی بکەم، وەکو فەرەنسیان و مەیموونان کڕنۆش بەرم و سەر دابنەوێنم، دەبێ وەکو دژمنی سەرسەخت و رکونی تەمەشا بکرێم؟ باشە پیاوێکی قسە لەرووی، هەق بێژی، سینەسافی، لە رق و کینە بەدەر، بۆی نییە بژی؟ باشە گوناح نییە کۆمەڵێك سپڵەی پێنەزان، لەگام و فێڵباز، و هەزار روو، حەقیقەتی پرشنگداری کابرایەکی وا بشێوێنن؟!
***گرای***: سەروەری پر مەرحەمەت، جەنابی عالیتان، لە نێو ئەم جەماعەتەدا کێتان مەبەستە؟
***گلۆستەر***: مەبەستم تۆی بێ شەرەفە، تۆی سپڵەی پێ نەزانە، تۆی بودەڵەیە. ئاخر من کەنگێ خراپەم دەرهەق بە تۆ کردووە؟ یان تۆ؟ تۆ؟ یا هەر یەکێك لە پێرەکەی ئێوە؟ داوەشێن، دەك عەمرتان نەمێنێ، خوا گیانتان بسێنێ! جەنابی خاوەنشکۆ خوا راوەستاوی بکات، لەبەر شکات و شکاتکاری ئێوە بۆ تاقە ساتێ ناهێورێ.
***شابانۆئیلیزابیت***: گلۆستەری برام، تۆ بە هەڵە لە مەسەلەکە حاڵی بوویت. پاشا بە خۆی بە شوێنیا ناردوویت، هیچ کەسێك لێی هان نەداوی، لەوەیە هەستی بەو رق و نەفرەتە دەروونییەی تۆ کردبێ کە بەرانبەر بەکەسوکاری من، براکانم و خۆم هەتە و لە کردەوەکانتا دیارە، بۆیە ناردوویەتی بە دووتا تا بە خۆی بچێتە بنج و بناوانی ئەو رقەو بنجبڕو چارەسەری بکات.
***گلۆستەر***: تێ ناگەم، شیرازەی دنیا تەواو تێکچۆووە، وای لێهاتووە بێچووە چۆلەکان لە لوتکەی وادا راوی خۆ دەکەن، کە هەڵۆیان نای وێرنێ، چونکە هەر رەمەکی و بۆرە پیاوێك بۆ خۆی بووە بە نەجیمزادەیەك، نەجیمزادان گلۆڵەیان کەوتووەتە لێژی و بوون بە بۆرە پیاگ؟
***شابانۆ ئەلیزابت***: هێواش هێواش، گلۆستەری برا، من دەزانم چیت مەبەستەو کوێت دێشێت، تۆ بەغیلی بە پێشکەوتنی من و دۆستەکانم دەبەی. بۆیە لە خوای گەورەم داوایە کە هەرگیز ئاتاجی تۆمان نەکات.

***گلۆستەر***: منیش لە خوا دەپاڕێمەوە، مەینەتی و نەگبەتیەکی وام بەسەرا نەیەت کە ئاتاجی تۆبم، هەر تۆ براکەمت بە حەپس کردن دا، هەر تۆ منت عەیبدار کرد، نەجیمزادەو ئەشرافانت سووك و چروك کرد، کەچی هەموو رۆژێك بەخشش و دیاری فرە دەدەی تا ئەو کەسانە بکەی بە میرو ئەشراف کە تاکو دوێنێ بایەخی پولێکی قەڵبیان نەبوو چ جای لەقەبی میرو ئەشراف.

***شابانۆئیلیزابیت***: قەسەم بەو خوایەی کە منی لە پلەو پایەکەی خۆمەوە، کە زۆر پێی رازی بووم، گەیاندوەتە ئەم لوتکە پڕ مەترسیە، هەرگیز خاوەنشکۆم لە میر کلارنس هان نەداوە، بەڵکو هێندەی لە توانامدا بووە شەفاعەتم بۆ کردووە، بەرگریم لێکردووە. قوربان تۆ زوڵم لە من دەکەی، زوڵمێکی نەنگئامێز، بە ناهەق ئەم هەموو گومان و بوختانە سووکەم بۆ هەڵ دەبەستیت.

***گلۆستەر***: ئەدی کێ لەم دواییەدا لورد هیستینگزی بە حەپس کردن دا، هەر تۆ نەبووی... دەتوانی حاشا لەمە بکەی؟

***ریڤەرز***: گەورەم جەنابی لۆرد، دەتوانێ، چونکە....

***گلۆستەر***: دەتوانێ (لۆرد ریڤەرز) کێ هەیە ئەمە نەزانێ! قوربان دەتوانێ حاشا لە شتی لەوەش گەورەتر بکات. دەتوانێ یارمەتیت بدات بگەیتە پلەو پایەیەکی بەرز و پاشان رای بگەیەنێ کە یارمەتی نەداویت و بە رەنجی خۆت و بە زەبری لیاقەت و شایستەیی لە رادەبەدەری خۆت بەو پایەیە گەییوی. جا چ شتێك هەیە نەتوانێ بیکا؟ دەتوانێ... ئەرێ وەڵڵا دەتوانێ و ئەولاتریش ...

***ریڤەرز***: تو ئەو خوایە چ شتێك دەتوانێ؟

***گلۆستەر***: بەزاتی خوا دەتوانێ، بەڵێ دەتوانێ مێرد بە پاشایەکی سەڵت، گەنج، قۆزی منداڵکار بکات... هەڵبەتە شووکردنەکەی داپیرەی تۆ خراتر بوو.

***شابانۆ ئەلیزابت***: جەنابی لۆرد گلۆستەر! من لە رادەبەدەر تەحەمولی تانەو تەشەرەکانی تۆم کردووە، سەبرم سواوەو لەوەی پتر ئەم سوکایەتییەت لێ قەبول ناکەم. قەسەم بە زاتی خوا هەموو ئەم قسە زبرو ناشیرانەت بۆ خاوەنشکۆ دەگێڕمەوە. خۆزیا کارەکەرێکی دێهاتی بوایەم، نەك شابانۆیەکی بەناو مەزنی، بەمجۆرە ئیهانەکراوی ***رەنجێنراو (شابانۆ مارگرێت وەژوور دەکەوێ و لە پشتەوە دەوەستێت)***

من هیچ خێرو بێرێکم لە تەخت و تاجی ئینگلتەرا دەست نەکەوتووە، جگە لە تۆزێك شادی.

***شابانۆ مارگرێت***: خوا ئەو تۆزەشت لێ بسەنێ! پلەو پایەکەت، شان و شەوکەوتەکەت، تەخت و تاجەکەت هەر هەمووی هەقی منە.

***گلۆستەر***: چیە! هەڕەشەم لێدەکەی کە بە پاشا دەڵێی؟ بڕۆ پێی بڵێ، بێ منەت بەو هیچی لێ مەشارەوە. دەیسا گوێ بگرە: من دەچمە لای پاشاو هەر چیم گوتووە لەبەردەم خۆیشیا دەیڵێمەوە، قیروسیا با بۆ زیندان، بۆ بورجم بنێرێ، مادامەکی کەس بە رەنجی من نازانێ، ئیدی وەختی ئەوە هاتووە بە دەنگی بەرز قسەی خۆم بکەم.

***شابانۆ مارگرێت***: بڕۆ شەیتان! من تا ئێستاش هەوڵ و رەنجی تۆم لە یادە، فەرامۆشم نەکردووە، زۆر باشم لەبیرە کە هنری ی مێردمت لە بورجێ و ئیدواردی پەپولە، ئیدواردی کوڕمت لە (تۆکسبەری)دا کوشتن.

***گلۆستەر***: ئەرێ، بەر لەوەی تۆ ببی بە شابانۆ، و بەر لەوەی مێردەکەت ببێ بە شا، هەرچی کاری قورسی هەبوو بەسەر شانی منەوە بوو، کوتەکی دەستی ئەو بووم، دژمنە سەرسەختەکانیم لە نێو دەبرد و بە دڵ و بە گیان دۆستەکانیم دەلاواند و خەڵاتم دەکردن. خوێنی خۆم لە کاسە کرد تا خوێنی پاشایەتی لە دەماری ئەو بگەرێ.

***شابانۆ مارگرێت***: بەڵێ خوێنێکت رشت پاکتر لە خوێنی ئەو ولە خوێنی خۆت.

***گلۆستەر***: بەڵام بە درێژایی ئەو کاتانە تۆو گرای مێردت هەوادار و لایەنگریماڵباتی لانگستەر بوون. هەروەها تۆش ریڤەرز، مەگین مێردەکەت لە (سەنت ئاڵبونسی،) لە شەڕی مارگرێت دا نەکوژرا؟ ئەگەر لە بیرت نەماوە، با من بیرتی بخەمەوە کە تۆ جاران چی بوویت و ئێستا چیت. من چی بووم و ئێستا چیم.

***شابانۆ مارگرێت***: تۆ ئەوساو ئێستاش هەر کابرایەکی جەلادو خوێنرێژ بووی!

***گلۆستەر***: کلارنسی بەستەزمان، (وریك)ی خەزوری شەرمەزار کرد، سوێندەکەی خۆیشی نەبردە سەر، مەسیح لێی خۆش بێ!

***شابانۆ ماگرێت***: خوا هەقی بکات!

***گلۆستەر***: پاداشتی ئەم لۆردە داماوە کەشان بە شانی ئیدوارد و لەبەر خاتری ئەو شەڕی تەخت و تاجی کرد، ئەوە بوو کە بخرێتە زیندانەوە. بەڕاستی چاکەی سەربەخۆ سەری ساحێبی.. بریا خوا دڵی منیشی وەکو دڵی ئیدوارد لەبەرد دروست دەکرد، یا دڵێکی میهرەبانی وەکو دڵی منی بەو دەدا، من وەکو منداڵ سادەو ساویلکەم، بە کەڵکی ئەم ژیانە نایەم.

***شابانۆ مارگرێت***: دەیسا حەیات بێ و خۆت بگەیەنە دۆزەخ! دەست لە یەخەی ئەم ژیانە بەردە، ئەی شەیتانی شەڕ، ئەوێ شوێنی شایستەی تۆیە، ئەی شەیتانی نەفرەت لێکراو.

***ریڤەرز***: قوربان، جەنابی لۆرد گلۆستەری من، ئێمە لەو رۆژگارە دژوارانەدا کە تۆ بیرمانی دەخەیەوەو گەرەکتە بیسەلمێنی کە لەبەرەی دژمندا بووین، ئێمە پەیڕەوی پاشای خۆمان، پاشای فەرمی و یاسایی خۆمان دەکرد. وەکو چۆن ئەگەر تۆش ببیتە پاشامان، پەیڕەویت دەکەین و گوێڕایەڵی فەرمانت دەبین.

***گلۆستەر***: پاشای ئێوە! حەز دەکەم ببمە چەرچی نەك پاشای ئێوە! ئەوەی بیرم لێ نەکردبێتەوە پاشایەتییە.

***شابانۆ ئەلیزابت***: جا قوربان، ئەگەر پێت وابێ پاشایەتی ئەم مەملەکەتە هیچ خۆشییەکی بۆ تۆ تیا نابێ، ئەوا هەق وایە هەست بەوەش بکەی کە شادی و خۆشی منی شابانۆی ئەم وڵاتە چەند کەمە

***شابانۆ مارگرێت***: ئەگەر شابانۆی ئەم وڵاتە لە بەختی خۆی ناڕازی بێ، ئەدی من — کەشابانۆم و زەڕەیەك شادیم نییە، چ بڵێم! بەسە، سەبرم سوا، لەوەی پتر تەحەمول ناکەم ***(دێتە پێشترەوە)***

گویّ بگرن دزانی بەشەڕهاتوو، ئەی ئەو پاتەخۆرانەی لەسەر دابەشکردنی ماڵی تاڵان بردەی من ورگی یەکتر هەڵدەدەڕن! کیّ لە ئێوە دەتوانیّ تەمەشای من بکات و نەلەرزیّ؟ ئەگەر وانییە، خۆ من شابانۆم، کەواتە وەکو رەعیەت کڕنۆشم بۆ بێنن، بەلاّم چونکە بە خۆتان لاتان بردووم و کەتنەکەتان کردووە، وەکو یاغی و تاوانباران دەلەرزن، ئەی تاوانباری ترسنۆك، هەی بودەڵە، ئەگەر پیاوی رووتم لیّ وەرمەگێڕە!

***گلۆستەر***: ئەی پیرەژنی نەگریسی دەموچاو چرچەڵەی رەزا قورس، چی تۆی گەیاندە ئێرە؟

***شابانۆ مارگرێت***: هیچ، تەنیا بۆ ئەوە هاتووم، تاوانەکانت بژمێرم ، بەڵیّ تا ئەم کارە نەکەم وازت لێناهێنم!

***گلۆستەر***: باشە تۆ بەو مەرجە نەفی نە کرابووی کە ئەگەر بگەڕێیتەوە بکوژرێی؟

***شابانۆ مارگرێت***: با، بەلاّم مەرگی ئێرەم خۆشترە، لە نەفی کردنەکەی ئەوێم، تۆ خوێنی مێردێك و کوڕێك بە من قەرزاری، خوێنی مێردەکەم و کوڕێکم لە ئەستۆی تۆیەو تۆش مەملەکەتیّ، ولاّتیّ بە من قەرزاری! ئەی هاوپەیمانان من لەگەڵ هەمووتانمە، ئەو خەم و کەسەرەی من هەمە، ئەگەر راستتان دەویّ هی ئێوەیە، ئەو کەیف و شادییەی کە ئێوە زەوتتان کردووە، لە راستیدا هی منە.

***گلۆستەر***: ئەوە ئاهو نزولەی بابە نەجیبەکەی من بوو کە تۆی گرت، کاتیّ تاجی کارتونیت لەسەری جەنگاوەرانەی ناو بە زەبری ئیهانە کردن روباری فرمێسکت لە چاوانی رشت، ئەوجا بۆ ئەوەی وشکیان بکاتەوە، دەسماڵێکت دایە کە خلّتانی ئەو خوێنە پاکە بوو کە لەبەر (روتلاند)ی جوانخاس رۆیی بوو.

ئەمە هەمووی ئاهی ئەو بوو کە وای بەسەر هێنای، تالاّوی رۆحی بوو کە بەسەرتا باری، خودا، تۆڵەی کردارە خوێناوییەکەی خۆتی لیّ سەندەوە نەك ئێمە.

***شابانۆ ئەلیزابت***: ماشەڵلا لە عەدالەتی ئاسمان، بزانە چۆن هەقی بیّ تاوانان دەکاتەوە.

***هیستینگز***: ئەریّ وەڵلا ، بەڕاستی کوشتنی ئەو منداڵە، کارێکی چەپەڵ بوو، کارێك بوو نە کەس دیتبووی و نە کەس بیستبووی.

***ریڤەرز***: تەنانەت ستەمکارانیشی خستە گریان.

***دورست***: هیچ کەسێك باوەڕی نەدەکرد تۆڵەی ئەوە بکرێتەوە.

***بکینگهام***: (نورتمبرلاند) کە لەو کاتەدا لەویّ بوو، کە بینی گریا.

***شابانۆ مارگرێت***: سەیرە! ئەوە چییە! خۆ بەر لە هاتنی من، ئێوە خەریك بوو ورگی یەکتان دەدڕی، دانتان لە یەکدی دەکرۆشت و ئامادە بوون ملی یەکدی بشکێنن، کەچی لە پڕ رووی بوغزو کینەتان دەکەنە من؟ ئایا تووك و نەفرینی سامناکی یورك، بەو رادەیە کاری لە خودا کردووە کە بە مەرگی هنری و مردنی ئیدواردی جوانکیلەی من، لە دەست چوونی سەڵتەنەتی وان و نەفی کردنی خەمناکی من، تۆڵەی کوژرانی ئەو منداڵە جیقنە بکاتەوە؟ ئایا تووك نەفرین دەتوانن هەوران بڕن و بگەنە ئاسمان؟ کەواتە ئەی هەوری خەمبار، رێگا بۆ تووك و نەفرینی

شێرزەی من بکەوە! تەمەنا دەکەم پاشا نەوسنەکەت ئەگەر لە شەڕا نەمرد بە ئینتەلا بمرێت[*]، وەکو چۆن پاشای ئێمە بە غەدر کوژرا تا ئەو بێتە شوێنی! خودایا ئیدواردی کوڕت کە هەنووکە شازادەی وێڵزە، لە تۆڵەی کوڕەکەی مندا بمرێ کە شازادەی وێڵز بوو، سا خودایە خێر لە خۆی نەبینێ و جوانە مەرگ بێ، وەکو چۆن کوڕەکەی من جوانە مەرگ بوو! خودا تۆڵەی منی شابانۆی جاران لە تۆی تازە شابانۆ بکاتەوە، و نەمریت هەتا وەکو منی کلۆڵی بێنەوا، لێدەکەوی، و بە چاوی خۆت زەلیلی خۆت دەبینی! یاخوا مەرگی کوڕەکانت بدینی و بۆیان بگریت، یاخوا وەکو چۆن من تۆ دەبینم بە شوێنەکەی من شاد بوویت، تۆش ئافرەتێکی دیکە بدینی بەم شوێنەی تۆ شاد بێ! لە خوام گەرەکە ڕۆژانی شادی و خۆشیت، بەر لە خۆت بمرێ، و دوای ساڵانێکی دوورو درێژ لە خەم و پەژارە، نە وەکو دایك، نە وکو ژن و نە وەکو شابانۆی ئینگلتەرا بمریت، ریڤەرز، دورست، و تۆش لورد هیستینگز! کاتێ کوڕەکەی من بەر خەنجەری خوێناوی درا، بە دیارییەوە وەستان و تەمەشاتان کرد. لەو خودایەم گەرەکە کە شتاقتان بە مەرام نەگەن، عەمرتان کورت و بە کارەساتی کوتوپڕ تەواو بێ!

***گلۆستەر***: لە تووك و نەفرەتان بویتەوە ئەی پیرە سیحربازی دەعەجانی قێزەون؟

***شابانۆ مارگرێت***: دەتەوێ لە تووك و نەفرەتانت ببوێرم؟ نا، گوێ بگرە سەگی خوێڕی، بزانە چی دەڵێم: ئەگەر ئاسمان جگە لەو دەردو بەڵایانەی من بۆتی تەمەنا دەکەم، تاعونێکی پڕ ژانتری پێیە، با هەڵیگرێ بۆ ئەو کاتەی تاوانەکانت تەواو دەگەن، هەنگێ رق و غەزەبی خۆیت بەسەردا برێژێ، ئەی مایەفیتنەی ئەم ژیانە پڕ کوێرەوەرییە، ئومێدەوارم تا ماوی خۆرەی لە روحت بدات و پێت وابێ کە دۆستانت، خیانەتکاران و تاوانباران ئازیزترین دۆستی تۆن، ئومێدەوارم خەو لە چاوانی ناشیرین و سامناکت بتارێ، تەنیا ئەو کاتانە نەبێ کە خەونێکی سامناك بە دۆزەخی پڕ لە ئەهریمەنانی شێواوەوە دەبینی، جا تۆ ئەی بەدفەساڵی بیچم سزی شووم، ئەی بەرازی تێر نەخۆری چڵێس، ئەی ئەو کەسەی هەر لە رۆژی لە دایکبوونەوە لە چارەت نووسراوە بیچم سزو شەڕانیو کوڕێکی دۆزەخی، مایەی شەرمەزاری دایکە خەمینەکەی بێ، ئەی ئەو کەسەی بەرەی باب قێزی لێدەکاتەوە، ئەی پەڵەی شەرمەزاری سەر ئابڕوو، ئەی قێزەونی بێزراو!.

***گلۆستەر***: مارگرێت!

***شابانۆ مارگرێت***: ریچارد!

***گلۆستەر***: بەڵێ!

***شابانۆ مارگرێت***: لەگەڵ تۆم نییە.

***گلۆستەر***: ببوورە، وامزانی ئەم هەموو جنێوە ژەهراوییەت لەگەڵ منە، بەو ناوە ژەهراوییانە من بانگ دەکەی!.

***شابانۆ مارگرێت***: بەڵێ لەگەڵ تۆم بوو، بەڵا چاوەڕوانی وەڵامی تۆ نیم، واز بێنە با تووك و نەفرەتەکانم تەواو بکەم!

---

[*] ئاماژەیە بۆ نەوسنی و زۆر خۆری ئیدواردی چوارەم

***گلۆستەر***: من بۆم تەواو کردیت، کە بانگم کردیت: مارگرێت، ئیدی تەواو بوو.
***شابانۆ ئەلیزابت***: بەو جۆرە تووك و نەفرەتکەت رووی خۆتی گرتەوە.
***شابانۆ مارگرێت***: ئەی شابانۆی کارتۆنی، ئەی سێبەری بۆش و بەتاڵ و بێ رەنگی، شکۆو مەزناهی من، بۆچی هەنگوینی خۆت بەسەر ئەو جاڵجاڵۆکە بە ژەهر ئاوساوەدا دەکەی، ئەو جاڵجاڵۆکەیەی جۆلاّتەنەی کوشندەت بە دەورا دەتەنیٚ؟ هەی ئەحمەق، کەودەن! تۆ چەقۆیەك تیژ دەکەی، کە خۆتی پێدەکوژیت. رۆژێ دێ، لێم دەپاڕێیەوە، یارمەتیت بدەم کە تووك و نەفرین لەو بۆقە قەمورە ژەهراوییە بکەی.
***هیستینگز***: ئەی ژنە تێڕوانی درۆزن، زارت لێکنێ و واز لە تووك و نەفرەتان بێنە! دەنا کاسەی سەبرمان پڕ دەبێ و ئەزیەتت دەدەین.
***شابانۆ مارگرێت***: کاسەی سەبری تۆ؟ دەك داوەشێی.
***ریڤەرز***: ئەگەر بە گوێرەی خۆت مامەڵەت لەگەڵ بکرایە، تۆزێ نەزاکەتت تیا دەبوو.
***شابانۆ مارگرێت***: ئەگەر بە گوێرەی خۆم مامەڵەم لەگەڵ کرابا، تۆزێك ئەدەبتان بەرانبەرم دەبوو، و خۆتان بە رەعیەتی من، و منتان بە شابانۆی خۆ دەزانی. کەواتە بە گوێرەی خۆم مامەڵەم لە تەکدا بکەن، و ئەرکی خۆتان بزانن!
***دورست***: مەیدوێنن، شێتە.
***شابانۆ مارگرێت***: ئاگات لە زارت بێ مەرکیز، بێ ئەدەبی نەکەی! خەڵکی هێشتا بەم لەقەبە تازەیەیان نەزانیوی، بریا ئەی نەجیبزادەی لاو دەتتوانی پەی بەوە بەری کە دەردی لە دەست دانی ئەو لەقەبە چەند گرانە! ئەوانەی لە بەرزی و لوتکەدا دەوەستن، دەکەونە بەر باهۆزانی توندو تووش، و ئەگەر هەڵدێرێن هەپرون بە هەپرون دەبن!
***گلوستە***ر: بە زاتی خوا ئەمە ئامۆژگارییەکی زۆر چاکە، پەندو قسەی نەستەقە —ئەزبەری کە- ئەزبەری کە جەنابی مەرکیز!
***دورست***: قوربان ئەم ئامۆژگارییە چەند من دەگرێتەوە ئەوەندەش تۆ دەگرێتەوە.
***گلۆستەر***: ئەرێ، لە تۆش زیاتر.. بەلاّم من بەسەر لوتکانەوە لە دایك بووم، هێلانە بەرزەکەمان لەسەر ترۆپکی دار سەروان رۆنراوە، ئاشقێنی دەگەڵ باهۆزان دەکات و گاڵتەی بە هەتاو دێ.
***شابانۆ مارگرێت***: بەری تیشکی هەتاو دەگرێ و تاریکی دەکات، مەخابن، سەد حەیف و مەخابن کە هەتاوی کوڕەکەی من ئێستا لە تاریکی مەرگدا نووستووە، پاش ئەوەی رق و کینەی تۆ تیشکە پرشنگدارەکەی لە تاریکیی هەمیشەییدا زندە بەچاڵ کرد. هێلانە بەرزەکەتان لە جێی هێلانە بەرزەکەی ئێمە رۆنراوە، دەیسا خوایە خۆت بینای، قارو غەزەبی خۆتی بەسەردا داباریێنە، وەکو چۆن بە خۆێن بەدەستیان هێناوە، بە خوێن لە دەستی بدەن!
***گلۆستەر***: بەسە، بەسە، ئەگەر بەزەییت بە منا نایەتەوە، شەرم لە خۆت بکە.
***شابانۆ مارگرێت***: باسی بەزەیی و شەرم ونەنگ بۆ من مەکە، چونکە تۆ بێ بەزەییانە رەفتارت دەگەڵ من کرد، زۆر بێ شەرمانە هیواو ئاواتەکانت کوشتم. بە جۆرێ رۆحم و بەزەییم بووە بە

یەکپارچە رق و ژیانم بووە بە نەنگ و شەرم! تووڕەیی و خەمی من تاکو ئێستاش لەو نەنگ و شەرمەدا دەژی.

***بکینگهام***: بەسە، بەس!

***شابانۆ مارگرێت***: میرم، بکینگهام، من دەستەکانت ماچ دەکەم، ئەمە نیشانەی دۆستایەتی و تەباییمە لەگەڵ تۆدا، ئومێدەوارم خێرو خۆشی بێتە ڕێی خۆت و ماڵباتە نەجیبەکەت. چونکە دەستی تۆ نەچووەتە خوێنی ئێمە، جلکی تۆ بە خوێنی ئێمە لەکەدار نەبووە، بۆیە تووك و نەفرینی من تۆی نەگرتووەتەوە.

***بکینگهام***: هیچ کەسێکی لە ئامادە بووان نەگرتووەتەوە، چونکە تووك و نەفرین تاقە بستێك لە خاوەنەکەی دوور ناکەوێتەوە.

***شابانۆ مارگرێت***: نەخێر باوەڕی تەواوم هەیە کە دەگاتە ئاسمان و بەرۆکی خوا دەگرێ و تاگیرا نەبێ دەستبەرداری نابێ. ***(لە بەینی خۆی و ئەودا)*** بکینگهام، ئاگات لەو سەگە بێ ها، ئاگات لە خۆ بێ. نهێنگیرە، دۆستایەتی نافامێ، لە پڕ دەگەزێ، کەڵبەی ژاراوی دەگەیەنێتە سەر ئێسقان و پیاو دەگەیەنێتە شەرای مەرگ، لێی نزیك مەبەوە، ئاگات لە خۆ بێ، گوناح، مەرگ و دۆزەخ هەموو مۆرو داغمەی خۆیان پێوە ناوەو شەیتانانی گوناح و مەرگ و دۆزەخ گشت لە گشت دەخزمەتی ئەودان.

***گلۆستەر***: جەنابی لورد بکینگهام، ئەو ژنە چ دەڵێت؟

***بکینگهام***: ئەزبەنی سەروەری پڕ مەرحەمەتی من، شتێکی ئەوتۆ ناڵێت، بۆ خۆی دەڕێسێ.

***شابانۆ مارگرێت***: چی! گاڵتەم پێ دەکەی، گاڵتەت بە ئامۆژگارییەکانم دێ، مەرایی ئەو شەیتانە خەتەرە دەکەی کە من پێت دەڵێم لێی دوور کەوە؟ کەواتە ئەگەر ڕۆژێ هات و داخی نا بە دڵتەوە، ئەم قسەیەی من وەیاد بێنەوەو بڵێ مارگرێتی بەستەزمان هەر زوو پەردەی لە روو هەڵماڵی، دەیسا ئومێدەوارم هەر یەکێك لە ئێوە بەر رق و غەزەبی ئەو بکەوێ، و ئەویش بەر غەزەبی ئێوە بکەوێ، هەمووتان بەر قارو غەزەبی خوا بکەون!

***(وەدەر دەکەوێ).***

***هیستینگز***: کە گوێم لە تووك و نەفرینی ئەو دەبێ، مووم لێ نابزوێ.

***ریڤەرز***: منیش، تێناگەم بۆچی بەم ڕادەیە ئازادی دراوەتێ.

***گلۆستەر***: نە هەقی ناگرم، قەسەم بە زاتی مریەمی پاکیزە، لە ڕادەبەدەر زوڵمی لێکراوە، من هەستدەکەم ژێوانم لەوەی بەشداریم لەو زوڵمەدا کردووە.

***شابانۆ ئەلیزابێت***: من ئەوەندەی بزانم، هیچ زوڵمێکم لێ نەکردووە.

***گلۆستەر***: ئەگەر زوڵمیشت لێ نەکردبێ، ئەوا بەری ئەو زوڵمە دەخۆی کە لەو کراوە، من زۆر بە گەرمی خزمەتی کەسێکم کرد، کەچی ئێستا زۆر بە ساردی باسی ئەو هەموو خزمەتەم دەکات، بەڵام سەبارەت بە کلارنس، قەسەم بە مەریەمی پاکیزە باشترین سزای خۆی وەرگرت، ئەوەتا لە بری چاکەکانی، بۆ سەر بڕین دابەستراوە! خوا هیدایەتی ئەوانە بدا کە بە حەپسکردنیان دا.

***ریڤەرز***: دەم خۆش، دوعایەکی زۆر باشە، پڕ بە پێستی یاساکانی مەسیحیەتە، مەسیحیەت وا دەخوازێ دوعای خێر بۆ ئەو کەسانە بکەین کە ئەزیەتیان داوین.

***گلۆستەر***: من هەمیشە ئەم کارە دەکەم (لەبەر خۆوە)، ئەمە ئەوپەڕی ئاقڵییە، هەر چەندە سەر دێنم و سەر دەبەم، ئەگەر من لە نەفرەت کردن بم، رووی خۆمیش دەگرێتەوە.

***(کاتسبی وەژوور دەکەوێ)***

***کاتسبی***: خانمی گەورە، خاوەنشکۆ تۆی گەرەکە، هەروەها تۆشی گورەکە ئەزبەنی، ئێوەش لوردانی بەڕێز.

***شابانۆ ئەلیزابت***: باشە کاتسبی، هەر ئێستا دێم... سەروەران ئێوە لەگەڵم نایەن.

***ریڤەرز***: بەڵێ خانم، لە خزمەتتا دێین.

***(جگە لە گلۆستەر، هەموو وەدەردەکەون)***

***میر گلۆستەر***: من زوڵم و تاوانە کە دەکەم و لە پێش هەموو کەسێك دا دەکەومە سکاڵاو دادو بێداد، تاوانە شەڕانی و نهێنییەکانی خۆم دەدەمە پاڵ کەسانی دیکە، ئەوەتا بۆ چارەنووسی کلارنس دەگریم، ئەو کلارنسەی بە خۆم هەواڵەی زندانی تاریك و نوتەکم کرد. لەبەردەم ئەم سافیلکە خۆشباوەڕانە دا: هیستینگز، و داربی و بکینگهام وا دەنوێنم کە شابانۆو دەست و پێوندەکەی، پاشایان لە کلارنسی برام تیژ کردووە، ئەوەتا باوەڕیان بە قسەکەم کردووەو زۆرم لێدەکەن تۆڵە لە ریڤەرز و فوگان و گرای بکەمەوە، بەڵام من هەناسەی داخ و کەسەر هەڵدەکێشم و دەقێکی ئینجیلیان بۆ دێنمەوە کە خوا داوامان لێدەکات پاداشتی خراپە بە چاکە بدەینەوە. بەو جۆرە چەند کەونە دەقێکی سەیر لە ئیجیلەوە دەدزم و بەدکاری و شەڕخوازی ئاشکرای خۆمی پێ دەشارمەوە، بەو جۆرە لەپێستی قەدیساندا دەوری شەیتان دەبینم.

***(دوو پیاوکوژ وەژوور دەکەون).***

بەڵام هێواش، بێدەنگ! ئەوە جەلادەکانم وا هاتن. دەی دۆستانی بە جەرگ و جوامێرم کێوە دەچن، دەچن بۆ ئەنجامدانی کارەکە؟

جەلادی یەکەم: بەڵێ ئەزبەنی —هاتووین بەرگە لەتۆ وەربگرین تا بتوانین بچینە لای.

***گلۆستەر***: زۆر چاکتان کردووە، حازرە ***(بەرگەکەیان دەداتێ)*** کە لێ بوونەوە بۆ (کروسپی پالاس) بگەڕێنەوە . بەڵام ئاغایان دەبێ پەلە لە کوشتنەکەی بکەن، دڵتان رەق بێ و گوێ لە لالانەوەو پاڕانەوەی مەگرن. چونکە کلارنس کەسێکی بەدەم و زمان و قسەزانە، ئەگەر گوێی لێبگرن، لەوەیە دڵتان نەرم بکات.

***جەلادی یەکەم***: سەروەرم هیچ خەمت نەبێ، گوێ لە وڕێنەکانی ناگرین. ئێمە پیاوی چەنەبازی نین، پیاوی بە دەم و زمان، بێ کردەوەیە، دڵنیابە ئێمە بۆیە هاتووین کە دەستمان بەکار بێنین نەك زمانمان.

***گلۆستەر***: دەبێ کاتێ فرمێسك لە چاوی گەوجان دەڕژێ، چاوانی ئێوە بەرداشیان لێ ببارێ، بە راستی خۆشم دەوێن شێرەکوڕان، بڕۆن بۆ کاری خۆتان و لە هیچ مەپرینگێنەوە، بڕۆن، بڕۆن، — لە زێکەن.

***جەلادی یەکەم***: بە چاوان ئەزبەنی، وا دەڕۆین.

***(بە دوو قۆڵی وەدەردەکەون).***

## دیمەنی چوارەم

## لەندەن- بورجەکە

(کلارنس و بروکنبری وەژوور دەکەون)

***بروکنبری:*** گەورەم، بۆچی ئەمڕۆ زۆر خەمبار دیاری؟

***کلارنس:*** ئاه، شەوێکی یەکجار ناخۆشم رابوارد، شەوێکی تەژی لە دیمەنانی ترسناك و خەون و مۆتەکانی تۆقێنەر، شەوێك کە بابایەکی مەسیحیایی خواناسی وەکو من، حەز ناکەم جارەکی دی ببیینمەوە، ئەگەر بارتەقای یەك دنیا رۆژانی خۆشیش بێ، تەحا کە شەوێکی ترسناك بوو!

***بروکنبری:*** چیت لەو خەونەتدا بینی گەورەم؟ حەزەکەم بۆمی بگێڕییەوە.

***کلارنس:*** لە خەوما لە بورج هەڵاتبووم، سواری کەشتییەك بوو بووم تا بەرەو براگاندی بڕۆم، لە خەوما گلۆستەری برایشم لەگەڵ بوو، هانیدام کە لە خەوتنگەکەم وەدەرکەوم‌و لە حەوشی کەشتییەکە دا پیاسە بکەم، لەوێندەرەوە روانیمانە ئینگڵتەرا، ئیدی باسی هەزارو یەك کارەسات و ساتی سامناکمان کرد کە لە شەڕی نێوان هەردووماڵباتی یورك و لانگستردا بە سەرمان هاتبوون. لە خەوەکەمدا، کە بە جووتە بە حەوشی کەشتییەکەدا پیاسەمان دەکرد، وام هاتە خەیاڵ کە گلۆستەر هەڵنووتا، پرم دایە بیگرمەوە، کەچی بەدەم کەوتنەکەیەوە دەڵەکی دام، لە کەشتییەکە کەوتمە خوارەوەو شەپۆلی وڕوژاوی دەریا تێم وڕوکا، خودایا، خودایا، چەند ناخۆشە پیاو غەرقی دەریا بێ و بمرێ. کە گوێم لە دەنگی ئاوەکە دەبوو خەریك بوو زراوم بتۆقێ! تەحا کە سامناك بوو! سەدان دیمەنی سامناکی مەرگم هاتنە بەرچاو! وام دەزانی دارو پەردووی هەزار کەشتی تێکشکاو دەبینم، هەزار پیاوم دەبینی کە ماسی دەیخواردن، بینیم، کۆمەڵە زێڕ، و لەنگەری گەورەو کۆمەڵە مرواری و زومرڕدو جەواهێری بایەخدارم بینی کە هەر هەمووی لە بنی دەریادا بڵاوبوو بوونەوە. هەندێکیان لە کاسەسەری پیاوانی مردوودا گیرسابوونەوە، گەوهەرانی پرشنگدار رژابوونە ئەو چاڵانەوە کە سەردەمانێ شوێنی چاوان بوون، لە تۆ وایە گاڵتە بەو چاوانە دەکەن، وەکو ئاشقانی لە ئەشقا سووتاو ئاشقێنیان لەگەڵ کەڤ لینجی ناخی دەریادا دەکرد و گاڵتەیان بە ئێسك و پروسکی پەڕاگەندەی مردووانی دەوروبەری خۆ دەکرد.

بروکنبری: باشە تۆ لە کاتی مردنەکەتدا هێندەت دەرفەت هەبوو کە لە نهێنییەکانی ناخی دەریا وردبیتەوە؟

***کلارنس:*** پێدەچوو ئەو دەرفەتەم هەبێ، زۆرم هەوڵدا گیان بەن گیان ئافەرین بسپێرم، بەڵام شەپۆلی ڕکونی لە بەدەنما دەیهێشتەوەو رێگەی نەدەدا بێتە دەرێ و ئاوێتەی هەوای خاڵی، کراوەو، سەرگەردان بێ، شەپۆل روحی لە سینەمدا کە هانکە هانك لێیدەدا راگرتبووم، کە خەریك بوو شەقی دەبرد و فڕێی بداتە دەریاوە.

***بروکنبری***: باشە ئەم عەزابە بە ژان و ژارە بێداری نەکردیتەوە؟

***کلارنس***: بێداربوونەوەی چی، نەخێر! دوای مردنیش، خەوەکەم هەر بەردەوام بوو، وام هەستکرد، گەرداوەکە بەرەو روحم دێ، و روحم بەگەڵ دەریاوانانی گرژو مۆن کەوت و شاعیران گوتەنی بۆ مەملەکەتی تاریکی ئەبەدی پەڕییەوە. یەکەم کەس کە لەوێندەر تووشی روحی غەریبم بوو، خەزوری مەزنم، "وریك"ی بەناوبانگ بوو، کە بە دەنگی بەرز هاواریکرد: "ئەمە چ تۆڵەیەکە مەملەکەتی تاریکی بۆ کلارنسی خیانەتکاری داناوە؟" ئەوسا ئەو لە چاو ون بوو، هەنگێ تاپۆیەکی فریشتە ئاسا، قژ زەردی لە خوێنا هەڵکشاو، شپرزەو مەیلەو سەرگەردان هاتە پێشێ و بە دەنگێکی تیژ هاواریکرد: "ئەوا کلارنس هات، کلارنسی خاپینۆك، بێ بار، پەیمان شکێن و خیانەتکار کە لە شەڕەکەی نزیکی (تۆکسبری)دا بە خەنجەران کوشتمی! دەسا ئەی فریشتانی تۆڵە پەلاماری بدەن و تالاوی عەزابی بە گەروودا بکەن!" هەر کە ئەو قسەیەی کرد لەشکرێك لە شەیتانانی چەپەڵ دەوریان گرتم و وەکو لورەی شوومی کسۆکان بە گوێیاندا لوراندم، ئەوە بوو بە دەم لەرزینەوە لەو سەگوەڕە خەبەرم بووەوە. کاریگەری ئەو خەونە هێندە سامناك بوو تا ماوەیەك دوای ئەوەش هەر وام دەزانی لە دۆزەخدام.

***بروکنبری***: قوربان نە هەقت ناگرم کە ترسابیت، باوەڕت بێ، کە تۆ دەیگێڕیتەوە من خەریکە هەترەشم بچێ.

***کلارنس***: ئێی بروکنبری، ئەو کارانەی کە ئێستا روحم ئازار دەدەن، من هەموویم لەبەر خاتری ئیدوارد ئەنجام داوە، دەبڕوانە، بزانە چۆن پاداشتم دەداتەوە. خودایا، ئەگەر نوێژو دوعاو نزای گەرم و گوڕی کانگای دڵم بەزەییت ناجوڵێنێ و دەتەوێ تۆڵەی بەدکارییەکانی خۆمم لێ بکەیەوە، قارو غەزەبت تەنیا بەسەر خۆمدا بڕێژە، روحم بە ژنە بێگوناحەکەم و منداڵە داماوەکانم بکە، ئەی نیگابانی نەجیب و میهرەبان تکات لێ دەکەم بە جێم مەهێڵە.. باری روحم قورسە، خەوم دێ، خەو.

***بروکنبری***: خەمت نەبێ جەنابی لۆرد، بە دیارتەوە دەبم، خودا ئاسوودەیی و ئارامی بە سەروەرم ببەخشێ.

***(کلارنس دەخەوێ).***

خەم، کات و وختان دەگۆڕێ، ئارامی و ئاسودەیی دەتارێنێ،
شەو دەکات بە بەیانی و نیوەڕۆ بەشەو
شازادان، تەنیا لەقەبەکانیان هەیە شانازی پێوەبکەن، شانازییەکی رواڵەتی لە هەنبەر تەقەلایەکی باتینی،
لەبری شادی و بەختیاری ئایدیالی،
هەست بە دنیایەکی پڕ لە ترس و نیگەرانی دەکەن،
زۆر جار رووبەڕووی کۆمەڵێك کێشەو خەمی کوشندە دەبنەوە. تەنیا شۆڕەت و ناوبانگە رواڵەتیەکەیانە کە لە رەمەکی خەڵکیان جیادەکاتەوە.

***(جووتە جەلادەکە وەژوور دەکەون)***

***جەلادی یەکەم***: ئەهای! کێ لەوێیە؟

***بروکنبری***: خودایە! تۆ کێی و چۆن بۆ ئێرە هاتوویت؟

***جەلادی یەکەم***: دەمەوێ قسان دەگەڵ کلارنس دا بکەم، بە پێیان بۆ ئێرە هاتووم!

***بروکنبری***: بۆچی بەو کورتیە قسان دەکەی؟

***جەلادی دووەم***: جەناب،کورت بێژی چاترە لە درێژدادڕی، بەرگەکەی پێ نیشان بدە، و لەوەی زیاتر قسان مەکە. ***(بروکنبری بەرگەکە دەخوێنێتەوە)***.

***بروکنبری***: لەم فەرمانەدا (بەرگە) دەستوریان بەمن داوە کە میر کلارنس بە ئێوە بسپێرم، من موناقەشەی ناوەڕۆکی فەرمانەکە ناکەم، چونکە نامەوێ هیچ زانیارییەکم دەربارەی مەبەستەکەی هەبێ و حەز ناکەم دەستی منی تێدا بێ، ئەمە کلیلەکان، و هۆوەش جەنابی میرە کە لەوێندەر نووستووە، بە خۆیشم دەچمە خزمەتی پاشا، و ئاگاداری دەکەمەوە کە بەمجۆرە زیندانییەکەم بە ئەنگۆ سپاردووە.

***جەلادی یەکەم***: کارێکی ئاقڵانە دەکەی ئەزبەنی، بەخێر بچی .

***(بروکنبری وەدەردەکەوێ)***

***جەلادی دووەم***: چی! بە نووستووی بیکوژم؟.

***جەلادی یەکەم***: نەء! چونکە کە خەبەری بێتەوە، گلەیی دەکا، دەڵێ بە نامەردی کوشتمان.

***جەلادی دووەم***: چی؟ کە خەبەری بووەوە؟ قەلەپیاو، تا ڕۆژی قیامەت خەبەری نابێتەوە.

***جەلادی یەکەم***: ماڵ خراپ، لە ڕۆژی قیامەتدا گلەیی دەکات و دەڵێت لە خەوا کوشتوویانم.

***جەلادی دووەم***: وشەی (قیامەت) جۆرە پەشیمانیەکی لە ویژدانما چێکرد.

***جەلادی یەکەم***: یانی چی؟ دەترسیت؟

***جەلادی دووەم***: لە کوشتنەکەی ئەو ناترسم، چونکە ئەمڕۆ فەرمانم پێیە، بەڵام دەترسم بە هۆی کوشتنی ئەوەوە، بەر نەفرەت بکەوم و بچمە دۆزەخ و لەوێ هیچ ئەمرو فەرمانێك فریام ناکەوێ.

***جەلادی یەکەم***: وامدەزانی پیاوێکی بە ورەیت و بڕیاری خۆت داوە.

***جەلادی دووەم***: بەڵێ پیاوێکی بە ورەم و بڕیاری خۆم داوە، ورە بەرزی و پیاوەتی ئەوەیە کە نەیکوژم.

***جەلادی یەکەم***: کەواتە بۆ لای میر گلۆستەر دەگەڕێمەوەو ئەمەی پێ دەڵێم.

***جەلادی دووەم***: تکایە تۆزێکم لێ بوەستە. ئومێدەوارم ئەم سۆزو گودازە گەرمە بەرم بدات. من وا راهاتووم هەر کە تا ژمارە بیست بژمێرم ئیدی ئەم حاڵەتە سۆزدارییە بەرم دەدا.

***جەلادی یەکەم***: ها، ئێستا چۆن خۆت دەبینی؟

***جەلادی دووەم***: سەیرە، هێشتا هەندێ پاشماوەی ئازاری ویژدانم، لەدڵ و دەروونا ماوە.

***جەلادی یەکەم***: ئەوە بیرۆ خۆت بێنەوە، هەر کە لێ بووینەوە دەچین خەڵاتەکەمان وەردەگرین.

***جەلادی دووەم***: قەسەم بە زامەکانی مەسیح دەبێ بمرێت، خۆ خەڵاتەکەم لە بیر چوو بوو.

***جەلادی یەکەم***: ئێستا ویژدانت لە کوێیە؟

***جەلادی دووەم***: سەیرە، لە کیسەکەی میر گلۆستەردایە!

***جەلادی یەکەم:*** کەواتە،کاتێ میرگلۆستەر سەری کیسەکەی شل دەکاتەوە تا پاداشتەکەت بداتێ، ویژدانت دەردەپەڕێ و دەفڕێت .

***جەلادی دووەم:*** قەیدی نیە، وازبێنە بابفڕێ، ئەوانەی پابەندی ویژدانن یا کەمن، یا هەر نین.

***جەلادی یەکەم:*** ئەدی ئەگەر جارێکی دی بەرۆکی گرتیەوە؟

***جەلادی دووەم:*** خۆمی لێناکەم بە خاوەن، ویژدان شتێکی خەتەرە بنیادم ترسنۆك دەکات. گەر بیەوێ دزییەك بکات سەرزەنشتی دەکات، گەر بخوازێ جنێو بدات رێی نادات، گەر بیەوێ لەگەڵ ژنی هاوسێیەکدا ڕابوێرێ ریسوای دەکات. ویژدان روحێکی زندووی شەرمنەو لە سینەی بنیادەمدا یاخی دەبێت و کۆسپی دنیای دێنێتە ڕێگە. جارێکیانبە ڕێکەوت کیسەیەك زێڕم دۆزی بووەوە، ویژدان ناچاری کردم بیدەمەوە بە خاوەنەکەی. هەر کەسێك ویژدانی هەبێ و پابەندی ویژدان بێ دەکەوێتە سواڵ، خەڵکی شارو شارۆچکان ویژدانیان وەکو شتێکی خەتەرناك شار بە دەرکردووە، هەر کەسێ بیەوێ بە خۆشی بژی هەوڵدەدا پشت بە خۆی ببەستێ و بەبێ ویژدان بژی، تەنیا گوێ لە هەواو هەوەسی خۆی دەگرێت.

***جەلادی یەکەم:*** ئەوەتا لەم ساتەدا هاتۆتە پەنامەوەو هانم دەدا کە میر نەکوژم.

***جەلادی دووەم:*** شەیتان بخە مێشکی خۆتەوەو ویژدان قەبوڵ مەکە، چونکە دێتە بن دەستەوەو بەرە بەرە کارت تێ دەکات و ناچارت دەکا پەشیمان ببیتەوە.

***جەلادی یەکەم:*** من پیاوێکی بەهێزم، دڵنیات دەکەم کە ناتوانێ کارم تێ بکات.

***جەلادی دووەم:*** ئەمە قسەی پیاوی ئازایە، پیاوێك کە بە خەمی شۆرەت و ناوبانگی خۆیەوە بێ، دەی با دەست بەکار بین، ئەدی بۆ ئەم کارەیان رانەسپاردووین؟

***جەلادی یەکەم:*** بە دەسکی شمشێرەکەت بە سەریا بکێشەو پاشان بیخە کوپە شەرابەکەی ئەو ژوورەی تەنیشتەوە.

***جەلادی دووەم:*** تەگبیرێکی زۆر چاکە! لە کۆپەکەی هەڵدەکێشین تا ببێ بە شەرابی شەرابان.

***جەلادی یەکەم:*** هیواش! دەجوڵێتەوە!

***جەلادی دووەم:*** با لێی بدەین.

***جەلادی یەکەم:*** نەخێر، با لە پێشا تۆزێ قسەی دەگەڵ بکەین.

***کلارنس:*** نیگابان لە کوێی؟ پەرداخێ بادەم بدەیە.

***جەلادی دووەم:*** پاش تۆزێکی دی هێندە شەراب دەخۆیەوە. مڕ دەبی جەنابی لۆردا.

***کلارنس:*** ئەرێ تۆ کێی؟

***جەلادی دووەم:*** پیاوێکم وەکو تۆ

***کلارنس:*** بەڵام تۆ وەکو من لە خوێنی خاڵیسەی شاهانە نیت.

***جەلادی دووەم:*** تۆش لە دڵسۆزیدا وەکو ئێمە نیت.

***کلارنس:*** دەنگت وەکو هەورە تریشقەیە، بەڵام بیچم و هەیئەتت بچووکە.

***جەلادی دووەم:*** چونکە دەنگم ئێستا دەنگی پاشایە، بەڵام هەیئەتم، هەیئەتی خۆمە.

***کلارنس:*** قسەکانت بۆنی مەرگ و تاریکیان لێدێ! چاوانت هەڕەشەم لێدەکەن بۆچی بەمجۆرە ڕەنگت زەرد بووە؟ کێ بۆ ئێرەی ناردووی؟ بۆچی هاتووی؟

***هەردوو جەلاد:*** بۆ ئەوەی، بۆ ئەوەی...

***کلارنس:*** بۆ ئەوەی بمکوژن؟

***هەردوو جەلاد:*** بەڵێ، بەڵێ.

***کلارنس:*** ئێوە زاتی ئەوەتان نەکرد بە ڕاشکاوی ئەمەم پێ بڵێن، کەواتە زاتی ئەوەش ناکەن بمکوژن. ئاخر من چ خراپەیەکم دەرهەق بە ئێوە کردووە هاوڕێیان؟

***جەلادی یەکەم:*** تۆ هیچ خراپەیەکت بۆ ئێمە نەبووە، بەڵکو خراپەت بۆ پاشا بووە.

***کلارنس:*** چ قەیدییە ئاشتی دەکەمەوە.

***جەلادی دووەم:*** مەحاڵە ئەزبەنی! خۆت بۆ مەرگ ئامادە بکە.

***کلارنس:*** یانی لە نێو هەموو خەڵکیدا ئێوە یان هەڵبژاردووە تا بێ گوناحان بکوژن؟ باشە گوناحی من چییە؟ کوا بەڵگەی تاوانباریم؟ کام دەستەی دادوەرانی قانونی، قەراری خۆیان خستووەتە بەردەستی قازی گرژ و مۆن؟ یان کێ حوکمی ناڕەوای مەرگی کلارنسی بەلەنگازی دەرکردووە؟ ئێوە کە هەڕەشەی مەرگم لێ دەکەن، بەر لەوەی قانون بمگرێ، ئەمە کارێکی یەجگار نا قانونیە، بۆیە بە نێوی خوێنی ئازیزی مەسیحەوە کە لە پێناوی گوناهە گەورەکانی ئێمەدا هاتۆتە ڕشتن، داواتان لێدەکەم ئەگەر بە تەمان خوا لێتان خۆش بێ، لێرە بڕۆن و دەستی تاوان بۆ من درێژ مەکەن، چونکە ئەو کارەی ئەنگو چوونەتە ژێر باری، خودا نەفرەتی لێکردووە.

***جەلادی یەکەم:*** ئێمە بۆیە ئەو کارە دەکەین، چونکە فەرمانمان پێکراوە.

***جەلادی دووەم:*** ئەوەی فەرمانی پێکردووین پاشایە.

***کلارنس:*** ئەی بەندەی نەزان! پاشای گەورەی پاشایان (خوا) لە لەوحی مەحفوزا، نەی لە تاوانی کوشتن کردووە، فەرموویەتی: "نابێ قەتڵ بکەی" کەچی دەتانەوێ فەرمانی ئەو لە عاردی بدەن، و بە فەرمانی بەشەر بکەن؟ دەیسا چاك بزانن کە تۆڵە لە دەستی ئەودایە، بەسەر ئەو کەسانەی دا دەڕێژێ کە لە فەرمان و یاساکانی دەردەچن.

***جەلادی دووەم:*** جا هەمان تۆڵە لە تۆ دەکاتەوە، چونکە هەم سوێندی بە درۆت خواردووەو هەم قەتڵیشت کردووە. تۆ سوێندت بە کتێبی موقەدەس خوارد کە لە پێناوی ماڵباتی لانگستەردا بجەنگی.

جەلادی یەکەم: کەچی سوێندەکەت نەبردە سەر و خیانەتت لە ئەمانەتی خوا کرد، و بە شمشێرە خیانەتکارەکەت ورگ و ریخۆڵەی کوڕی پاشات هەڵدڕی.

***جەلادی دووەم:*** کە تۆ سوێندت بۆی خوارد بوو، خۆشت بوێ و بیپارێزی و بەرگری لێ بکەی.

***جەلادی یەکەم:*** ئیدی چۆن دەتوانی بە فەرمان و شەریعەتی خوا بمانترسێنی، لە کاتێکا خۆت بەو شێوە تاوانکارییە لە عاریت داوەو پێشێلت کردووە؟

***کلارنس:*** ئەفسوس! من لە پێناوی کێدا ئەو تاوانەم کرد؟ لە پێناوی ئیدواردا، لەبەر خاتری براکەم. نا، برادەران، ئەو بۆ ئێرەی نەناردوون تا لەسەر ئەوە من بکوژن، چونکە بە خۆیشی بە

ئەندازەی من لەم تاوانەدا شەریکە، جا چاك بزانن، ئەگەر خوا بیەویٚ تۆڵەی ئەو کارە بسەنیٚ، بە ئاشکرا دەیسەنیٚ چونکە جڵەوی هەموو کارەکان لە دەستی بە توانای خۆیدایە، پێویستی بەو ڕێگا پڕ پێچ و پەناو نارەوایانە نییە، تا تۆڵە لە گوناحباران بکاتەوە.

***جەلادی یەکەم***: باشە کیٚ ڕێی بە تۆدا کە ببی بە پەیکی مەرگ و نەونەمامێکی ئازای وەکو پلانتاجنت، ئەو تازە لاوە، ئەو ناسکە میرە، جوانخاسە بە دەستی تۆ بکوژریٚ؟

***کلارنس***: خۆشەویستی برایەکەم، و شەیتان ، و توڕەیی خۆم.

***جەلادی یەکەم***: جا هەر بەو پێودانگە، خۆشەویستی براکەت و، ئەرکی خۆمانو، تاوانبارای تۆ وادەخوازن کە بتکوژین.

***کلارنس***: ئەگەر ئێوە براکەمتان خۆش دەویٚ. نابیٚ من ببوغزێنن، نابیٚ بم ڕەنجێنن، من برای ئەوم و لە کانگای دڵمەوە خۆشم دەویٚ. خۆ ئەگەر بە پارە بەکریٚ گیراون، ئەوا بگەڕێنەوە، دەتانێرم بۆ لای گلۆستەری برام، کە بزانیٚ من ماوم، زۆر لەوە زیاترتان دەداتیٚ کە ئیدوارد لە بری مەرگم دەتانداتیٚ.

***جەلادی دووەم***: زۆر سەهوی، چونکە گلۆستەری برات زۆری رق لێتە.

***کلارنس***: نەخێر، خۆشی دەویٚم و ڕێزم دەگرێت، بە ناوی منەوە بچن بۆ لای.

***هەردوو جەلاد***: بەڵیٚ باشە، وا دەکەین.

***کلارنس***: پێی بڵێن، کاتیٚ (میر یورك)ی بابمان هەر سیٚ کوڕەکەی کۆکردەوەو دەستە زەفەرمەندەکانی بەسەردا هێناین و دوعای خێری بۆ کردین، لە ناخی دڵەوە داوای لێکردین یەکترمان خۆش بویٚ، هەرگیز ئەوەی بە بیردا نەدەهات ئەم هەموو جەورو جەفاو ناکۆکییەمان بکەوێتە نێوان. بچنە لای گلۆستەر و ئەمەی بیر بخەنەوە، بزانن چۆن فرمێسکان دەبارێنیٚ.

***جەلادی یەکەم***: بەڵکو (بەرد) دەبارێنیٚ، وەکو چۆن فەرمانی بە ئێمە داوە لە جیاتی فرمێسکی بەزەیی، بەردی رقت بەسەرا ببارێنێنن.

***کلارنس***: نا، توخوا بوختانی بۆ مەکەن، چونکە زۆر میهرەبانە.

***جەلادی یەکەم***: بەڵیٚ، میهرەبانە وەکو ئەو بەفرەی لە وەرزی دروێنەو خەرماندا دەباریٚ. تۆ کەیفی خۆتە، خۆت هەڵدەخەڵەتێنی، ئەو بۆ ئێرەی ناردووین تا بتکوژین.

***کلارنس***: مەحاڵە چونکە کە لێکدی جیابووینەوە، لە هەمێزی گرتم و بەدەم گریانەوە سوێندی بۆ خواردم کە ئەوپەڕی هەوڵم بۆ دەدات کە رزگارم بکات.

***جەلادی دووەم***: بەڵیٚ ئەم کارە دەکات، لە ئەسارەتی ژیان رزگارت دەکات، بەرەو سەعادەتی ئاسمانت دەنێریٚ، ئەسپاردەی بە هەشتت دەکات.

***جەلادی یەکەم***: ئەزبەنی، نوێژی خۆت بکەو لەگەڵ خوادا بسوڵحیٚ، چونکە دەبیٚ بمریت!

***کلارنس***: جا ئێوە کە ئەوەندە خواناسن، داوا لە من دەکەن، نوێژ بۆ خوا بکەم و تۆبە بکەم، ئەدی بۆچی خۆتان لە بیر دەکەن، ئەوە فەرامۆش دەکەن کە بە کوشتنی من، دوژمنایەتی خوا دەکەن، خوا دەڕەنجێنن؟

براینە هۆشێکتان بێ و فریای حاڵی خۆتان بکەون، دڵنیابن ئەوەی فەرمانی ئەم تاوانەی پێ داون، هەر خۆی لەسەر ئەم کارە، دەتان بوغزێنێ و نەفرەتتان لێدەکات.

***جەلادی دووەم***: باشە چ بکەین؟

***کلارنس***: دڵتان نەرم بێ و روحی خۆتان لە گومڕایی رزگار بکەن.

***جەلادی یەکەم***: دڵمان نەرم بێ! نەخێر هەر باسی مەکە، چونکە ئەمە پیشەی ترسنۆکان یا ژنانە.

***کلارنس***: گریمان چەشنی دڕندەو بڕندەو شەیتانان زەڕەیەك ڕوحم و بەزەییتان لە دڵدا نیە، باشە کێ لەنگۆ ئەگەر شازادەیەکی، لیقەوماوی، دەستبەسەری، ئازادی زەوتکراوی وەکو ئێستای من بوایە، و جووتێ جەلادی خۆتان ئاسایی بهاتبانەسەری، لە پێناوی روح و ژیانی خۆیدا نەدەپارایەوە؟ جا من لەم حاڵەتەدا هەقی خۆمە بپاڕێمەوە، وەکو چۆن ئێوەش گەر بکەونە ئەم تەنگانەیەوە کە منی تێکەوتووم، هەقی خۆتانە بپاڕێنەوە.

***(جەلادی دووەم دەدوێنێ)***

ئێی هاوڕێم، ئەگەر چاوەکانت بەشەر خەڵەتێنە نەبن، هەندێ بەزەییان تێدا بەدی دەکەم. دەیسا تۆش تای من بگرەو بۆم بپاڕێوە بە هەمان شێوە بپارێوە کە ئەگەر وەکو من گیرۆدە بوایەی دەپاڕایتەوە. ئاخر کام گەدا، بەزەیی بە شازادەیەکدا نایەتەوە گەر گەدایی بکات؟

***جەلادی دووەم***: جەنابی لۆرد تەمەشای پاشەوە بکە!

***جەلادی یەکەم***: بگرە، ئەمە یەك، ئەمە دوو ***(بەرخەنجەری دەدا)*** ئەگەر پێت کەمن، لەو کوپە شەرابەی ئەوێشت هەڵدەکێشم، ***(جەنازەکە رادەکێشێتە دەرێ)***.

***جەلادی دووەم***: تەحا، کە بەشێوەیەکی دڕندانەو نامەردانە کوشتمان، چەند زوو تەواومان کرد! بریا دەمتوانی وەکو (پیلاتس)* دەستانم لەم قەتڵە هەرە دزیوو ناشیرینە دەشۆرد.

***(جەلادی یەکەم دەگەڕێتەوە)***

***جەلادی یەکەم***: کابرایەکی سەیری! پێم بڵێ، چۆن یارمەتیت نەدام؟ بە زاتی خوا جەنابی میر بەم کەمتەرخەمیەت دەزانێ!

***جەلادی دووەم***: بریا من براکەیم ***رزگار*** دەکرد، ئەوسا با هەر زانیبای. تۆ بچۆ خەڵاتەکە بۆ خۆت وەربگرە، و پێی بڵێ کە من ژێوانم لەوەی کە میر کوژراوە. ***(وەدەردەکەوێ)***

***جەلادی یەکەم***: من پەشیمان نیم. بڕۆ هەی ترسنۆك! دەبێ بە ئەمانەت جەنازەکە لە چاڵێك تەقەت بکەم تا جەنابی میر فەرمانی ناشتنی دەدات، پاش ئەوەی خەڵاتی خۆم وەردەگرم، سەری خۆ هەڵدەگرم و لەم وڵاتە دوور دەکەومەوە، چونکە ئەم قەتڵە زوو بەزوو ئاشکرا دەبێت و ئەم نهێنییە دەکەوێتە سەرزاران، نابێ لێرە بمێنم.

***(وەدەردەکەوێ)***

---

* پیلاتس pilate: حاکمێکی رۆمانی فەلەستین بووە لە زەمانی مەسیح دا، بە زوڵم و زۆر بە ناوبانگ بووە. بە گوێرەی یەکێك لە ئەفسانەکان لە یەکێك لە دەریاچەکانی ئەلب نێژراوە، هەموو ساڵێ، جارێك شەیتان لە ساڵیادی لە خاچدانی مەسیحدا لە جەستەی دێتە دەرێ و دایدەنێ و هەردوو دەستی دەشوات تا لە تاوانی بەشداری کردنی لەو کارە دزێوە، پاك ببێتەوە.

## فەسڵی دووەم

## دیمەنی یەکەم

## لەندەن، کۆشك

( دەنگی شەیپوران – شا ئیدوارد نەخۆشە، بەسەر کورسییەکەوە وەژوور دەکەوێ، شابانۆ ئەلیزابت، دورست، ریڤەرز، هیستینگز، بکنیکهام، گرای و خەڵکانێکی تری لەگەڵدان ).

***ئیدوارد شا*** : ئەمڕۆکە کارێکی زۆر مەزنم ئەنجامداوە، جا ئێوەش، ئەی نەجیمزادەو ئەشرافان، ئەم پەیمانی تەباییە بپارێزن، چونکە رۆژان دەژمێرم و چاوەنواڕی نێردراوێکی خودای خۆمم کە بێت و لەم ژیانەم رزگار بکات، هەنگێ روحم بە ئاسوودەیی و بێ خەم و خەیاڵ بەرەو ئاسمان هەڵدەفڕێ، مادامێکی لەم دنیایەدا سوڵح و ئاشتیم لەنێو دۆستان و ئازیزانی خۆمدا بەرقەرار کردووە. دەی هیستینگز، ریڤەرز دەست دەنێو دەستی یەکدی بخەن، بوغزو کینە وەلانێن و سوێندی دۆستایەتی و خۆشەویستی بۆ یەکدی بخۆن.

***ریڤەرز***: قەسەم بەخوا دڵم لە هەموو رق و بەغیلییەك پاك بووەتەوە، ئەوەتا دەستی ئۆخەی و خۆشەویستی لەسەر دڵم دادەنەم.

***هیستینگز***: منیش وەکو ئەو بەڵێن و پەیمان دەدەم، ئومێدەوارم خودا موەفەقم بکات.

***ئیدوارد شا:*** نەخەڵەتابن لە بەردەم پاشای خۆتانا درۆ بکەن، چونکە خودای گەورە، پاشای پاشایان درۆکەتان کەشف دەکات و هەر بە یەکتری لەنێوتان دەبات.

***هیستینگز***: خودا یار بێ لە سوێندو بەڵێنی خۆم ژێوان نابمەوە.

***ریڤەرز***: هەروەها منیش، چونکە هیستینگزم لە ناخی دڵەوە خۆش دەوێ.

***ئیدوارد شا*** : بانۆ، ئەم مەسەلەیە ئێوەش و (دروست)ی کوڕتیش دەگرێتەوە، هەروەها تۆش بکینگهام، ئێوەش لە بەینی خۆتانا، ناکۆك بوون و خەریکی دەستەبەندی بوون، بانۆ، دڵسۆزی لۆرد هیستینگز بەو دەستی بدەیە با ماچی بکات، بە دڵێکی پاك و بێ فێڵ و تەڵەکە ئەمە بکە.

***شابانۆ ئەیلزابت:*** فەرموو هیستینگز، لەمڕۆ بەدواوە هەرگیز باسی رق و ململانێی رابردوومان ناکەم، خودا تەوفیقی خۆم و کەسوکارم بدات.

***ئیداورد شا*** : دورست دەستی لە مل کە، هیستینگز تۆش بۆ لورد مەرکیز وەفادار بەو خۆشت بوێ.

***دورست***: من لە ناخی دڵەوە سۆز دەدەم کە خیانەت لەم خۆشەویستییە هاوبەشە نەکەم.

***هیستینگز***: هەروەها منیش سوێند دەخۆم جەنابی لۆرد.

*(دەست لە ملی یەکدی دەکەن)*

***ئیدوارد شا*** : ئێستاش نۆرەی تۆیە میر بکینگهام، هەستەو دەست لە ملی هاوپەیمانان و کەس و کاری ژنەکەم بکە، و بەم یەکێتییەتان من دڵخۆش بکە.

***بکنکهام***: "بەشابانۆ" خودا بمگرێ، بەر قارو غەزەبی خودا بکەوم، ئەگەر رق لە خۆت و لە کەسوکارت هەڵگرم، یان راستگۆیانەو لە ناخی دڵەوە خۆت و ئەوانم خۆش نەوێ. نزیکترن دۆستم لێ بڕەنجێن، لێم ببن بە دژمن، خودا لێمیان هەڵگێڕێتەو ئەگەر ساردی لە خۆشەویستی خۆت و جەماعەتەکەت بنوێنم.

***(دەست لە ملی یەکدی دەکەن)***

***ئیدوارد شا*** : میر بکینگهام، ئەم سۆزو پەیمانەی تۆ بۆ دڵەی نەخۆشی من دەرمانێکی شیفا بەخشە. ئێستا لێرەدا، تەنیا گلۆستەری برام ماوە، تا ئەم ئاشتییە ببێ بە ئاشتی تەواو.

***بکینگهام***: ئەوە هات، بەڕاستی لە کاتی خۆیدا هات.

***(گلۆستەر وەژوور دەکەوێ)***

***گلۆستەر***: بەیانیت باش شاهم، بەیانیت باش شابانۆم! نەجیبزادەو مەزنان رۆژتان باش.

***ئیدوارد شا*** : بەڕاستی رۆژێکی خۆش بوو، زۆر کاری خێرمان تیا ئەنجامدا، گلۆستەری برام. ئەم نەجیبزادە ناکۆك و دڕدۆنگ و بە ناهەق توڕاوانەمان ئاشت کردنەوە، ئاشتی جێی ناکۆکی، خۆشەویستی کینەی گرتەوەو هیچیان لە بەینا نەما.

***گلۆستەر***: ئەو کارە مایەی سوپاسە، ئەی خاوەنشکۆم! سەبارەت بەمن، هەر یەکێك لە نێو ئەم تاقمە شازادەیەدا، هەر یەکێك لە ئامادەبووان، لە ئەنجامی هەواڵی درۆوە، یا بەدگومانیەوە، یا بەد حاڵی بوونەوە، یان خراپەیەکی نەزانستەوە، یان توڕەبوونێکی کوت و پڕو کاتییەوە گلەیی لێم هەیەو بە دژمن و ناحەزم دەزانێ، پڕ بە دڵ تکای بوردنی لێدەکەم: چونکە چەند رقم لە مردنە، ئەوەندەش رقم لەدژمنایەتیە! خۆشەویستی هەر هەموو چاکە خوازانم گەرەکە، ئەی بانۆ لە تۆوە دەست پێدەکەم و تکای ئاشتی لە تۆ دەکەم، ئامادەم بەخزمەتی دڵسوزانەی خۆم بەهای ئەو ئاشتییە بدەم،

هەروەها تکا لەتۆش دەکەم ئەی بکینگهام، ئەی پسمامی نەجیبم کە تۆزێك بوغزو کینەمان لە نێوان دا هەبووبێ.

تکایە ئێوەش، جەنابی لورد ریڤەرز، و لوردگرای، تکا لە هەر هەموو ئەو کەسانەی کە بە ناهەق لێم زویر بوون، و ئەی دۆکان، و لوردان و، ئیرلان و سێران تکای سولح و ئاشتی لە هەر هەمووتان دەکەم، من کەمترین دژمنایەتیم دەرهەق بە هیچ رۆڵەیەکی ئەم وڵاتە (ئینگلتەرا) لە دڵدا نییە.

دڵم هێندە پاکە، دەڵێی دڵی ئەو منداڵەیە کە ئەمڕۆ، تازە لە دایك بووە.

هەڵبەتە سوپاسی خوا دەکەم کە ئەم بەهرەی بێ فیزییەی داومەتێ!

***شابانۆ ئەلیزابت***: لەمە بەدواوە، ئەم رۆژە بە درێژایی رۆژگار بە رۆژێکی پیرۆز دادەنرێ، لە خودا دەپارێمەوە کە چیتر بوغزو کینەمان نەگەڕێتەوە ناو... جا تۆش ئەی سەروەری خاوەنشکۆ، تکات لێ دەکەم کە لە کلارنسی برامان خۆش بی.

***گلۆستەر***: باشە بانۆ، من ئەم هەموو مەحەبەتەم نواندووەو پێشنیازی دۆستایەتی و ئاشتیم کردووە، تابەمجۆرە لە حوزری پاشادا ئیهانە بکرێم؟ کێ هەیە نەزانێ کە میری نەجیب مردووە؟ ***(هەموو بەم خەبەرە رادەچڵەکەن)*** تۆ بەم قسەیە گاڵتەی پێدەکەی، بێ حورمەتی بە جەنازەکەی دەکەی.

***ریڤەرز***: کێ هەیە نەزانێ مردووە! ئەدی کێ هەیە بزانێ؟.

***شابانۆ ئەلیزابت***: ئەی خوای گەورە، ئەی عالمی غەیبان، ئەمە چ دنیایەکە تێی کەوتووین؟

***بکینگهام***: ئەی لورد دروست، منیش وەکو ئەوانی دی رەنگم هەڵبزڕکاوە؟

***دروست***: بەڵێ ئەزبەنی، هیچ کەسێك لێرەدا نییە رەنگ بە روویەوە مابێ.

***ئیدوارد شا*** : کلارنس مردووە؟ خۆ من فەرمانەکەم گۆڕی بوو.

***گلۆستەر***: کلارنسی بەلەنگازو داماو بە فەرمانی یەکەمتان مرد، چونکە فەرمانی یەکەم پەیکێکی قۆچاغی میناکی میرکوری بردبووی، لێ ئەمری دووەم تەتەرێکی شەلی خاوی تەمەڵ برد بووی، کە گەیی بووەجێ، سەیری کردبوو خەریکی ناشتنی میرن، ئیدی خوا ئەو خوایەیە خەڵکانێکی زۆر کەمتر لە نەجابەت و دڵسۆزی ئەو، خەڵکانێکی نزیك لە خوێن رشتن، خەڵکانێك کە خزمی خوێنیی پاشانین، خەڵکانێکی موستەهەقتر لەو چارەنووسەی کلارنس، وەك بەرزەکی بانان لەو گۆڕەی بسوڕێنەوەو هیچ گومانێکیان لێ نەکردی ***(داربی وەژوور دەکەوێ).***

***داربی***: گەورەم، من خزمەتکاری بەردەرکەتم، خزمەتێکی زۆرم کردوویت، هاتووم چاکەیەکم دەگەڵ بکەی.

***ئیدوارد شا*** : تکایە وازم لێ بێنە، روحم غەرقی داخ و کەسەرە.

***داربی***: لێرە هەڵناسم تا ئەو چاکەیەم لەگەڵ نەکەی.

***شا*** : کەواتە خێرا قسە بکە بزانم چت دەوێ.

***داربی***: ژیانی خولامەکەم گەورەم، ئەمڕۆ پیاوێکی ئاژاوەچی کوشتووە، کە لەو دواییانەدا بە گەڵ دارو دەستەو زێڕەڤانەکانی میر نورفوك کەوتبوو.

***ئیدوارد شا*** : یانی زمانی من فرمانی مەرگ بەسەر برایەکەمدا بدات و پاشان هەر ئەم زمانە لە خولامێك خۆش بێ؟ براکەم کەسی نەکوشت. هەموو تاوانەکەی تەنیا خەیاڵێك بوو وبە سەریا هات، کەچی سزاکەی مەرگێکی بێ رەحمانە بوو، کیهەتان هاتنە لام و شەفاعەتێکتان بۆ کرد؟ کێتان لە بەردەممدا کەوتە سەر چۆك و تکای لێکردم لە کەری شەیتان بێمە خوارێ و گوێ بۆ بانگی ئەقڵ رادێرم؟ کێتان باسی برایەتی کرد؟ کێتان باسی مەحەبەت و خۆشەویستی کرد؟ کێتان پێی گوتم ئەو بەلەنگازە پشتی (وریك)ی مەزنی بەردا و لە پێناوی تۆدا جەنگی؟ کیهەتان رووداوەکەی شەڕی (توکسبری)ی بیر خستمەوە، خۆ بە خۆتان دەزانن کاتێ ئۆکسفورد بە عاردی دا دام، ئەو رزگاری کردم و پێی گوتم: "هەر بژی برای ئازیز و پاشایەتی خۆت بکە!" کیهەتان ئەوەی بیر خستمەوە کە کاتێ هەردووکمان لە مەیدانی شەڕدا مابووینەوەو خەریك بوو لەسەرما رەق دەبووینەوە، چۆن بە جلەکانی خۆی داپۆشیم، وخۆی بە کەمترین جلەوە بەو شەوە تۆقە مایەوە؟ تووڕە بوونی دڕندانەم هەر هەموو ئەو چاکانەی لە یادم بردەوە، شتاقتان ئەوەندەتان

شـەهامەت و پیـاوەتی تیـا نـەبوو ئەمـەم بـیر بخەنـەوە. بـەڵام کـاتێ عەرەبانچـی یـان خـولامێکی بەدەمەسـتی خۆتـان، قـەتڵێك دەکـات و سـیمای درەخشـانی خـودای مـەزن و رزگارکـەری هـەژیمان لەکـەدار دەکـات، ئـەوا یەکسـەر کڕنـۆش دێـنن و داوای بەخشـینی بـۆ دەکـەن! منـیش ئەگـەر عەداڵەتیشـم پـێ شـێل کـردووە دەبـێ داواکـەتان جێبـەجێ بکـەم. بـەڵام بـۆ بـرا بەلەنگازەکـەم چ کەسێك زمانی نەگەڕا، کەچی منیش، منی دڕندەش، تاقە جارێك بیرم نەکردەوەو خۆم نەدواند! کیهەتان زۆر مەزنن، بە ژیان قەرزارباری ئەون، کەچی تاقە کەسێکتان بۆ ئەوو لە پێنـاوی ژیـانی ئەودا نەهاتنە لام تا شـەفاعەتێکی بـۆ بکـەن. ئـاه، خودایـا، دەترسـم عەدالـەتی تـۆ بمگـرێ، بـەڵکو هەمووتان، دەستەو بـە ستەکانی مـن و تـیرەو هـۆزی هـەمووتان لەسـەر ئـەم کـارە ناڕەوایـە بگـرێ، هیسـتینگز بمگەیـە، یارمـەتیم بـدە تابگەمـەوە ژوورەکـەم، زۆر بەداخـەوە بـۆ تـۆ ئـەی کلارنسـی بەلەنگاز *(ژمارەیەك لەگەڵ شاو شابانۆدا وەدەردەکەون).*

***گلۆستەر***: ئـاخر ئەمەیـە ئاکـامی بـێ بـاکی و پەلـەکردن، ئـەدی نـەتان بـینی خزمـانی تاوانبـاری شابانۆ کە هەواڵی مەرگی (کلارنس) یان بیسـت چـۆن ڕەنگیـان زەرد هەڵگـەڕا؟ مەگـەر هـەر خۆیـان بـزانن چـەندیان لێخوێنـد و چـۆن پاشـایان پـڕ کـرد تـا ئـەم کـارە بکـات، بـەڵام خـوا دێـرگیری سەختگیرە، هەقی ئەویان لێدەکاتەوە، بەڵام با جارێ بچینە لای ئیدواردو دڵی بدەینەوە.

***بکینگهام***: فەرموو لە خزمەتی جەنابتاین.

## دیمەنی دووەم

## کۆشك

( دۆکبانۆی پیری یورك دەگەڵ دوو منداڵەکەی کلارنس دا وەژوور دەکەوێ )

***کوڕیژگە***: داپیرەگیان پێم بڵێ، بابمان مردووە؟

***دوکبانۆ***: نا، رۆڵەکانم

***کیژۆڵە***: ئەدی بۆچی دەگریت، سینگ دەکوتیت و هاوار دەکەی: "هۆ کلارنس، هۆ کوڕە بەدبەختەکەم"؟

***کوڕیژگە***: باشە ئەگەر بابی نەجیبمان نەمردبێ، بۆچی تەماشامان دەکەیت و سەر دەلەقێنی و بە بەدبەخت و سێوی بێزراومان ناو دەبەی؟

***دۆکبانۆ***: کوڕەزا جوانەکانم، نەوە ئازیزەکانم، ئێوە لێم تێ ناگەن، من بۆ، بۆ پاشا دەگریم، چونکە حەز ناکەم لە دەستی بدەم، بمرێت، بۆ بابی ئێوە ناگریم، چونکە گریان و خەم بۆ کەسێك لە دەست چووبێ، خەمێکی بێهودەیە، مردوو بە گریان ناژێتەوە.

***کوڕیژگە***: کەواتە دایە گەورە بەم قسەیەی تۆ بێ مردووە! هەڵبەتە مامە پاشام بەرپرسە لە مردنی ئەو، خودا هەقی دەکات. هەموو رۆژێ کە نوێژ دەکەم لە خودا دەپاڕێمەوە هەقی بابم بکات.

***کیژۆڵە***: مینش لە خوا دەپاڕێمەوە.

***دۆکبانۆ***: کڕبن رۆڵەکانم کڕبن، پاشا بە راستی خۆشی دەوێن، ئەی منداڵانی بێگەرد و پاك و سادە، ئێوە هێشتا بچکۆلانەن، ناتوانن سەبەبکاری مەرگی بابتان بناسن.

***کوڕیژگە***: با، دەتوانین داپیرە، مامە گلۆستەر گیانم پێی گوتم، شا بە فیتی شابانۆ کۆمەڵێك تاوانی بۆ هەڵبەستووە تا حەپسی بکات، مامم کە ئەمەی بۆ گێڕامەو دەستی بەگریان کرد، دەستی لە ملم وەرینا، و ئەم لاو ئەولای ماچ کردم و داوای لێکردم کە پشت بەو ببەستم و بە بابی خۆمی بزانم، و پێی گوتم کە وەکو منداڵی خۆی نازم هەڵدەگرێ و خۆشی دەوێم.

***دۆکبانۆ***: بە داخەوە! تۆ بزانە فێڵ و تەڵەکەبازی چۆن ئەم رواڵەتە میهرەبانە دەگرێتە خۆ، بوغزو کینەی چەپەڵ بە خۆشەویستی و چاکەی رواڵەتی پەردەپۆش دەکرێ. بەڵێ ئەو کوڕی منە، هەر ئەمەش مایەی نەنگ و شەرمەزاریو داخ و کەسەری منە، بەڵام ئەم تەڵەکەبازی و فریوکارییەی بەشیری منەوە نەخواردووە.

***کوڕیژگە***: داپیرە، تۆ پێت وایە، مامی درۆی لەگەڵ کردووم، و دستی ئەوی تێدایە؟

***دۆکبانۆ***: بەڵێ، کوڕی خۆم.

***کوڕیژگە***: باوەڕناکەم، گوێ بگرە! ئەو دەنگە چیە؟

***(شابانۆ ئەلیزابت بەقژی لوولی پەخش و پەریشانەوە وەژوور دەکەوێ، ریڤەرزو دورست لە دوای ئەوەوە وەژوور دەکەون).***

***شابانۆ ئەلیزابت***: لە خۆم خەمباریێ، لە خۆم ماڵ خرابیێ، هەنووکە کێ دەتوانێ بەری شیوەن و زاریم بگریێ؟ دەبا بۆ بەختی کلۆڵی خۆم بگریم، لەمڕۆوە نائومێدی دەبێ بە هاودەمم و روحم دەکێڵێ، دەبێ دژمنایەتی خۆم بکەم.

***دۆکبانۆ***: ئەوە چیە، ئەم شین و شەپۆڕەت لەپای چییە؟

***شابانۆ ئەلیزابت***: لێمگەڕێ با خۆم بکوژم، ئیدواردی پاشامان، ئیدواردی مێردم، ئیدواردی کوڕت مرد، کە ڕەگ مرد، لق و پۆپ چۆن دەژی؟ کە ئاوی ژیان بڕا، گەڵا چۆن ناژاکێ، چۆن سیس نابێ؟ یا دەبێ بژی و هەموو تەمەنی بە گریان بەرێتە سەر، یا دەبێ بمرێ، بلا مەرگ لە زێکاو فریای کەوێ، دەبا روحی باڵدارمان ڕەدووی پاشا کەوێ، دەبا وەکو ڕەعیەتی ئەمەکدار و گوێڕایەڵ دووی کەوین، خۆ بگەیەنینە مەملەکەتە تازەکەی، مەملەکەتی ئەبەدی شەو.

***دۆکبانۆ***: هاوار بە ماڵم، لەخۆم خەمباریێ. ئەو خەمەی لە تۆیە، بەشی گەورەی بۆ منە، تۆ خەمی مێردتە من خەمی کوڕ، من پێشتر بۆ مەرگی مێردێکی نەجیب و شایستە گریام، هەر بەو ئومێدە مام، بەو ئومێدە دەژیام کە لە ئاوێنەی رووی کوڕەکانیا سیمای نەجیبی ئەوم دەبینی، کەچی ئەمێستا مەرگی دڵرەق، رکونی، دوو ئاوێنەی بێگەردی لێ شکاندم، دوو ئاوێنە کە سیمای ئەویان بۆ دەنواندم، و هەنووکە ئەوەی مایەی تەسەلا بێ تەنیا یەك ئاوێنەی ریاکاری چاوخەڵەتێنە، بەداخ و کەسەرەوە تێی دەڕوانم و خەفەت بۆ ئەو نەنگ و شەرمەزارییە دەخۆم کە خستوومەتەوە، راستە تۆ بووی بە بێوەژن، کۆستت کەوت، بەڵام دایکیشی، دەتوانی دڵخۆشی خۆت بە منداڵەکانت بدەیتەوە. بەڵام من، مەرگ مێردەکەم لە باوەشم دەرێنا، لێی رفاندم، کلارنس و ئیدوارد، جووتە دارشەقەکەی ژێر باڵە لاوازەکانی لێ سەندمەوە. لە خۆم ماڵوێرانێ، خەمی تۆ نیوەی خەمی منە، بۆیە هەقی خۆمە لە تۆ پتر بناڵم، بلورێنم، شین و زاریم، شین و زاریق بشارێتەوە.

***کوڕیژگە***: مامۆژن، تۆ لە مەرگی بابی ئێمەدا نەگریای، ئەدی ئێمە چۆن دەتوانین لەگەڵتا بگرین و بە فرمێسکی کەسایەتی هاوخەمیت بکەین؟

***کیژۆڵە***: تۆ هیچ خەمێکت بۆ هەتیوکەوتنی ئێمە نەخوارد ئێمەش بۆ بێوەژن کەوتنی تۆ ناگرین!.

***شابانۆ ئەلیزابت***: یارمەتی گریانم مەدەن، بۆ خۆم دەتوانم هاواری خەمی خۆم بکەم، دەیسا کانیاوەکان بڕژێنە چاوەکانمەوە، تا هێندە بۆ مێردەکەم، بۆ ئیدواردی ئازیز بگریم، هەموو دنیا غەرقی فرمێسك بکەم. هاوار بە ماڵم بۆ مێردەکەم، بۆ ئیدواردی سەروەری ئازیزم.

***دوو منداڵەکە***: سەد حەیف و مەخابن بۆ بابمان، بۆ لورد کلارنسی ئازیزمان!

***دۆکبانۆ***: هاوار و سەد هاوار بۆ هەردووکیان، بۆ جووتە کوڕەکەم، ئیدواردو کلارنس!

***شابانۆ ئەلیزابت***: جگە لە ئیدوارد کێم شك دەبرد، کێ پشت و پشتیوانم بوو، ئەویشم مرد بە جارێ ماڵی وێرانم.

***دوو منداڵەکە***: جگە لە کلارنس کێ پشت و پەنامان بوو، ئەویش مرد، ماڵی وێرانمان.

***دۆکبانۆ***: جگە لەو دووانە کێم هەبوو، ئەوانیش مردن، بە جارێ ماڵی وێرانم.

***شابانۆ ئەلیزابت***: چ بێوەژنێك ئەم کۆستەی منی کەوتووە؟

***دوو منداڵەکە***: چ هەتیوێك وەکو ئێمەی لێقەوماوە؟
***دۆکبانۆ***: چ دایکێك، ئەم قوڕەی منی بۆ گێراوەتەوە؟!
هاوار لەمن، حەیف و سەد مەخابن، من دایکی خەم و ناڵەی هەموو ئەم بەدبەختانەم، ئەوان هەر کەسەو خەمی خۆی هەیەو من خەمی هەمووان، خەمی ئەوان یەکە، هی من هەزار. ئەو بۆ ئیدوارد دەگری، منیش لەگەڵیا، من بۆ کلارنس دەگریم، ئەو بۆی ناگری، ئەم جووتە منداڵە بۆ کلارنس دەگرین و ، منیش لەگەڵیانا، من بۆ ئیدوارد دەگریم، ئەوان ناگرین، دەبا فرمێسکی هەر سێکتان بەسەر مندا داکا، ئامێزم بۆ خەمەکانتان واڵا کردووە، بە هاواری گریەی خۆم دەیان لاوێنم، لە خۆم خەمباریێ، دەبا نەمێنم لە دنیایێ.
دورست (بە شابانۆ ئەیلزابت): مەگری دایکە، دایکی ئازیزم دان بە خۆتا بگرە! چونکە خودا پێی ناخۆشە بەم ناشکورییە پێشوازی لە قەزاو قەدەری بکەی. تەنانەت لە کاروباری دنیاییشدا، ناشکوریە مرۆڤ بە نە بەدڵی قەرزێك کە دەستێکی پڕ بەرەکەت بەوپەڕی میهرەبانی داویە پێی، بداتەوە. جا ناشوکری لەمە خراتر ئەوەیە مرۆڤ نکۆڵی لە قەرزی خودا بکات و کە خودا قەرزی شاهانەی خۆی لێ سەندەوە، پێی ناخۆش بێ و بەگژیا بچێتەوە.
***ریڤەرز***: بانۆی من، ئەزبەنی، وەکو دایکێکی بەردەبارو بە راو تەگبیر، مشورێکی کوڕەکەت، میری نەوجەوان بخۆ، و هەر ئێستا بە شوێنیا بنێرە، با تاجی پاشایەتی لەسەرنێ، هەنگێ سێبوریت دێ، خەم و پەژارەت لەگەڵ ئیدواردا بنێژە، تۆوی شادی خۆت لە تەخت و تاجەکەیدا داچێنەو زندوو بکەوە.
***(گلۆستەر: بکینگهام، داربی، هیستینگز و راتکلیف وەژوور دەکەون).***
***گلۆستەر***: هاوبەشی خەمتین خوشکێ، چەند بۆ ئاوابوونی ئەستێرەی پرشنگدارمان بگرین هێشتا کەمە، بەڵام گریان شیفای کول و کۆڤانان نادات، مردوو بە گریان ناژێتەوە، ئۆ دایکە، ئەمە تۆی! ببورە نەم بینیت (کڕنۆش دەبات).
دایکە گیان من کڕنۆشت بۆ دێنم، لێت دەپاڕێمەوە کە گەردنم ئازاو دوعای خێرم بۆ بکەی.
***دۆکبانۆ***: دوعای چاکان بێ، خوا راوەستاوت کاو میهرو خۆشەویستی و چاکەو خواناسی و راستگۆییت بخاتە مێشك و دڵ و دەروونەوە.
***گلۆستەر***: ئامین (لەبەر خۆیەوە) هەروەها عەمر درێژ و ساڵحم بکا، ئەوە خاتیمەی دوعای هەر دایکێکە، تێ ناگەم بۆچی دایکی میهرەبانم ئەو دوعایەی بەزاردا نەهات؟!
***بکینگهام***: ئێوە ئەی میرانی خەمگین، ئەی نەجیمزادانی دڵبرین، ئێوە ئەی خەمبارانی هاوبەشی ئەم کۆستە گشتییە هەموو وەك برا، راستگۆیانە و لە ناخی دڵەوە سەرخۆشی لە یەکدی بکەن، بە خۆشەوستییەوە دڵی یەکتر بدەنەوە. ئەگەرچی حاسڵاتی ئەم پاشایەمان خڕ کردووەتەوە، هاتووین تا حاسڵاتی کوڕەکەی بدورینەوە.
جا ئێوە کە زۆر نییە ئاشت بوونەتەوە، زامی رق و کینەی دڵی شکاوتان ساڕێژ بووەو گیرساوەتەوە، پێویستە ئەم تەباییە تازەیە بە شێوەیەکی دۆستانە درێژە بدەن و بیپارێزن با دڵتان لە یەکدی نەشکێتەوە، پێم وایە باشترین کار ئەوەیە یەکسەرو بەپەلە شاندێکی چکۆڵە بۆ

(لودلۆ) بنێرین، تا میری نەوجەوان بۆ لەندەن بێنن و بە عینوانی پاشای خۆمان تاجی لەسەر بنەین.

***گلۆستەر***: باشە بۆ شاندێکی بچووك جەنابی لورد بکینگهام؟

***بکینگهام***: تا نەبا، ئەگەر شاندو کاروانێکی گەورەمان بەگەڵ خست، کۆنە زامانی رق و کینەی تازە سارێژ بکولێتەوە، چونکە ئەمە ئاکامی باش نابێت، بە تایبەتی کە هێشتا جڵەوی کارو بار بەرەڵڵایەو هیچ دەستێك نەیگرتووەتەخۆ، جا لە شوێنێکدا کە کەس نەبێ، و هەر ئەسپە بە جڵەوی شۆڕەوە، بە کەیفی خۆی مل بنێ و لەگین بێ ڕێگەی خۆی بگۆڕێ، بەڕای من وەکو چۆن خۆ لە خەتەرو خەسارەتێکی راستەقینە دەپارێزین، دەبێ بە هەمان شێوە خۆ لە خەتەر و شەڕی ئیحتیمالیش دوور بگرین.

***گلۆستەر***: ئومێدەوارم پاشا هەمووماني ئاشت کردبێتەوە. من هێشتا لەسەر سوێزو بەڵێنی خۆمم.

***ریڤەرز***: هەروەها منیش، پێم وایە هەموو ئەوانی تریش هەر لەسەر گفت و بەڵێنی خۆن، بەڵام چونکە ئەو وەعدو بەڵێنانە هێشتا تازەن و تەواو نەچەسپیون، بۆیە نابێ بە هۆی قەرەباڵغی و کاروانێکی گەورەوە بیانخەینە خەتەرەوە، رەنگە ئەگەر بە قەرەباڵغی بڕۆین خەتەر بێ، بۆیە من لەگەڵ رایەکەی لۆرد بکینگهام دام، و وا چاکە چەند کەسێکی کەم، شاندێکی بچووك (میر) شازادە بۆ ئێرە بێنن.

***میستینگز***: منیش هەمان بۆچوونم هەیە.

***گلۆستەر***: کەواتە با قسەی ئێوە بێ، جا ئێستا با بڕۆین بزانین ئەوانەی راستەوخۆ بۆ (لودلۆ) دەچن کێن، بانۆ، تۆ، و دایکە تۆش دەتوانن بڕۆن و رای خۆتان دەربارەی ئەم کارە گرینگە دەربڕن؟

شابانۆ ئەلیزابت و دۆکبانۆ: بە دڵ و بە گیان.

***(جگە لە بکینگهام و گلۆستەر هەموو وەدەردەکەون)***

***بکینگهام***: سەروەرم، جەنابی لۆرد، ئەوانەی دەچن بە دووی میردا، هەر کێیەك هەن، تکات لێدەکەم، بیکە بە خاتری خوا، دەبێ لەگەڵیاندا بچین، چونکە لە ڕێگەدا کارێکی وەها ڕێك دەخەم کە خزمە بە هێزەکانی شابانۆ لە میر دوور بخەینەوە، تازەمینە بۆ ئەو تەگبیرە خۆش بکەین کە لەم دواییەدا لەسەری ڕێکەوتین.

***گلۆستەر***: ئەی هاوتای خۆم، ئەی ئامۆژگارە ئەمینەکەم، شیرەتکاری بەوەفام، ئەی پێشگۆو فاڵبینی من! ئەی ئامۆزای ئازیزم! وەکو منال بە گوێت دەکەم، کەواتە رابە بەرەو (لۆدلۆ)، چونکە نابێ لەوان دوا بکەوین.

***(بە دوو قۆڵی وەدەردەکەن).***

## دیمەنی سێیەم

## لەندەن – شەقام

**( دوو هاوولاتی وەژوور دەکەون و تووشی یەکتر دەبن )**

***هاوڵاتی ١*** : **مەرحەبا هاوسێ، ئەوە بەم پەلەیە کێوە دەچی؟**

***هاوڵاتی ٢*** : **باوەڕ بکە، بە خۆیشم بە تەواوەتی نازانم، ئەرێ هەواڵەکەت بیست؟**

***هاوڵاتی ١*** : **بەڵێ، پاشا مردووە.**

***هاوڵاتی ٢*** : **قەسەم بەو مەریەمی پاکیزەیە هەواڵێکی خراپە، بەنا شوکری نەبێ هەواڵی خۆش دەگمەنە، دەترسم، دەترسم بکەوینە رۆژگارێکی پڕ ئاژاوەوە.**

***(هاوڵاتی سێیەم وەژوور دەکەوێ)***

***هاوڵاتی ٣*** : **هاوسێکانم ماندوو نەبن، خوا قووەتتان بدات.**

***هاوڵاتی ١*** : **خێراندار بی قوربان.**

***هاوڵاتی ٣*** : **ئەرێ راستە ئیدوارد شا مردووە؟**

***هاوڵاتی ٢*** : **بەڵێ راستە، خودا رەحممان پێ بکات.**

***هاوڵاتی ٣*** : **برادەرینە چاوەنۆڕی فەرتەنەو ئاژاوەبن.**

***هاوڵاتی ١*** : **نا، نا، خوا یاربێ کوڕەکەی حوکم دەگرێتە دەست.**

***هاوڵاتی ٣*** : **واوەیلا بۆ دەوڵەتێك کە منداڵێك بەڕێوەی بەرێ!**

***هاوڵاتی ٢*** : **بە تەماین حاکمێکی چاك بێ، بێگومان تا پێدەگا و دەبێ بە هەژدە ساڵ، شیرەتکارو سەرپەرشتیارەکانی حوکمێکی چاك دەگێڕن کە گەورەش بوو هەنگێ حوکمێکی باش دەکات.**

***هاوڵاتی ١*** : **وەختێ هنری شەشەم لە پاریس تاجی لەسەر نرا تەمەنی نۆ مانگان بوو، واتە حاڵی دەوڵەت هەمان حاڵ بوو.**

***هاوڵاتی ٣*** : **هەمان حاڵ بوو؟ وانیە برادەرانی ئازیز خودا عەلیمە ئەو دەمە وڵات پڕ بوو لە گەورە سیاسەتوانان، پاشا کۆمەڵێك مامی چاکی هەبوو، و دەیان پاراست.**

***هاوڵاتی ١*** : **جا ئەم پاشایەش هەیەتی، مام و خاڵی هەن.**

***هاوڵاتی ٣*** : **بریا نەمامی هەبا، نە خاڵ، ململانێیەکە ئەوسەری دیار نییە، هەر کەسەو بە جۆرێ خۆی لێ نزیك دەکاتەوە، ئەم ململانێیە گەر خودا روحم نەکا دەبێ بە بەڵای سەری ئێمە، ئێوە میر گلۆستەر ناناسن، شیر حەرامێکی خەتەرە! کوڕو براکانی شابانۆش زۆر گەردنکێش و لە خۆبایین بریا حوکم کرابان، نەك حوکمیان کردبا، هەنگێ ئەم وڵاتە نەگبەتە دەحەوایەوەو وەکو جاران ئارام دەبووەوە.**

***هاوڵاتی ١*** : هێواش، هێواش، یەکجار بەو شێوەیەش نیە، ئێمە هەموو شتێك بە تارێکی دەبینین، بەڵام هەموو شتێك بە خێر دەگەڕێ.

***هاوڵاتی ٣*** : ئاقڵان بەر لە باران کەپنەك، (پاڵتۆ) لەبەر دەکەن. گەڵاڕێزان نیشانەی هاتنی زستانە، ك خور ئاوا دەبێ، کێ هەیە چاوەڕوانی شەو نەبێ؟ خەڵکی پاش گەرداو و تۆفانی کوت وپڕ پێشبنی قات و قڕی دەکەن.. گەر خوا ئیرادەی لەسەر بێ، ڕەنگە هەموو شتێ بەخێر بگەڕێ، هەڵبەتە ئێمە شایانی ئەوەنین، یا من پێشبینی ئەوە ناکەم.

***هاوڵاتی ٢*** : بەڕاستی ترس و نیگەرانی سەرو دڵی خەڵکی گرتووە، دەمی هەر کەسێك دەکەیەوە، هەر باسی خەم و ترس دەکا.

***هاوڵاتی ٣*** : ئەمە حاڵەتی پێش هەر گۆڕانێکی گەورەیە، خەڵکی بە غەریزە پێشبینی خەتەران دەکەن وەکو چۆن شەپۆلان بەر لە هەڵکردنی گەرداو دەهاڕوژێن، خەڵکیش بەو شێوەیە پێشبینی خەتەران دەکەن و دەهاڕوژێن. ئیدی خوا کەریمە، با بیدەینە دەستی خۆی، بۆ کوێ دەچن؟

***هاوڵاتی ١*** : لە دادگا داوا کراوین.

***هاوڵاتی ٣*** : منیش داوا کراوم –کەواتە لەگەڵ ئێوەدا دێم.

*(وەدەردەکەون).*

## دیمەنی چوارەم

## لەندەن – کۆشك

(مەزنی ئوسقوفانی یورك، میر یورکی نەوجەوان، شابانۆ ئەلیزابت، و دۆکبانۆ یورك وەژوور دەکەون. )

***مەزنی ئوسقوفان:*** بیستوومە کە دوێنی شەو لە (نورتامپتون – Northampton) ماونەتەوە، بێگومان ئەمشەویش لە (ستونی ستراتفور – Stony- Stratford) دەمێننەوە، ئیدی سبەی یا دوو سبەی دەگەنەوە ئێرە.

***دۆکبانۆ:*** بەڕاستی، لە ناخی دڵەوە تاسەی دیتنی میر دەکەم دەمێکە نەم دیتووە، ئومێدەوارم زۆر لەوسا گەورەتر بووبێ.

***شابانۆ ئەلیزابت:*** بەڵام وەکو من بیستوومە هیچ گەورە نەبووە، وەکو دەڵێن هەر لە قەدو بالای یورکی کوڕی مندا دەبێ و نابێ.

یورك :بەڵێ دایکە، هەر چەند من ئەمەم پێ خۆش نییە.

***دۆکبانۆ:*** بۆ پێت خۆش نییەن کوڕەزا چکۆلەکەم؟ خۆ گەورە بوون باشە.

***یورك:*** داپیرە ئێوارانێك بۆ شیو خواردن دانیشتبووین، خاڵە ریڤەرزم باسی ئەوەی کرد کە من زووتر لە براکەم گەورە بووم، مامە گلۆستەرم وەڵامی دایەوە: "بەڵێ، گیاو گوڵی بەسوود درەنگ گەشە دەکاو وردو ناسك دەبێ، بەڵام گیاکەڵەو گیای خراپ زۆر زوو گەشە دەکا و گەورە دەبێ". ئیدی لەوساوە هەرچی بیر دەکەمەوە، حەزناکەم زوو گەورە ببم، چونکە گیاوگوڵی پاك و جوان بە کاوەخۆ دەڕوێ و گەورە دەبێ، و گیاکەڵەی بێ بەر خێرا دەڕوێ و گەورە دەبێ.

***دۆکبانۆ:*** بە زاتی خوا ئەم مەسەلە بە هیچ جۆرێ خۆی ناگرێتەوە، ئەو کە گەورە بوونی تۆی پێ خۆش نییە و گاڵتەت پێ دکات، خۆی بە منداڵی زۆر وردیلەو بچووك بوو، زۆر درەنگ گەورە بوو، خۆ ئەگەر بە گوێرەی ئەو مەسەلە بوایە، دەبووایە ئێستا ناسکە پیاوێکی بێ وێنە بوایە.

***مەزنی ئوسقوفان:*** جا ئێستاش وایە بانۆ خانم

***دۆکبانۆ:*** یاخوا وابێ، دایکان هەقیانە هەندێ بە گومان بن،

***یورك:*** بە هەقی خوا گەر پێشتر بەمەم زانیبا، چەندی گاڵتە بە گەورەبوونی من کردووە دوو هێندە گاڵتەم بە گەورە بوونی خۆی دەکردەوە.

***دۆکبانۆ:*** یورکی ئازیزم چۆن گاڵتەت پێدەکرد؟ توخوا ئەگەر بە داپیرەی خۆت نەڵێی.

***یورك:*** دەڵێن مامم زۆر خێرا گەورە بووە، توانیویەتی لە تەمەنی دوو سێ سەعاتیدا نانە رەق بە ددان داکرۆژێ، بەڵام من لە تەمەنی دووساڵیدا ئەوجا ددانم هاتووە، ئەگەر ئەمەم پێی گوتبا، بەراستی دەمتەزاند داپیرە گیان.

***دۆکبانۆ:*** کێ ئەمەی بۆ باسکردویت یورکی ئازیزم؟

***یورك:*** دایە نەکەی، دایە گەورە.

***دۆکبانۆ***: دایەنەکەی؟! خۆ دایەنەکەی بەر لەوەی تۆ لە دایك بی، مردووە.

***یورك***: سا ئەگەر ئەو نەبووبیٚ، نازانم کیٚ[*] پێی گوتووم.

***شابانۆ ئەلیزابت***: مندالی لاسار کڕبە! بڕۆ هەی شەیتان.

***مەزنی ئوسقوفان***: خانمی هێژا، لە مندالەکە توڕە مەبە.

***شانانۆ ئەلیزابت***: دیواریش گوێی هەیە.

***(پەیکێك وەژوور دەکەویٚ)***

***مەزنی ئوسقوفان***: ئەوا پەیکێك هات، هەوالی چیت پێیە؟

***پەیك***: گەورەم، هەوالێك کە دلم نایە بیلێم.

***شابانۆ ئەلیزابت***: ئەدی میر "شازادە" چۆنە؟

***پەیك***: ساغ و سەلامەتە ئەزبەنی

***دۆکبانۆ***: کەواتە هەوالەکەت چییە؟!

***پەیك***: لۆرد ریڤەرز و لورد گرای، لەگەلٚ سێر تۆماس ڤۆگان دا بە حەپسی رەوانەی (پومفریت – Pomfret) کراون.

***دۆکبانۆ***: بە ئەمری کیٚ؟

***پەیك***: بە ئەمری هەردوو دۆکی (میر) مەزن گلۆستەر و بکینگهام.

***مەزنی ئوسقوفان***: بە چ تاوانیٚ؟

***پەیك***: ئەوەی دەمزانی عەرزم کردن، ئیدی نازانم ئەو نەجیبزادانە بۆ و بە چ تاوانیٚ حەپس کراون و گیراون ئەزبەنی.

***شابانۆ ئەلیزابت***: هاوار لە خۆم ئەوا لەبەر چاومە کە چۆن بنەمالەکەمان هەرەس دیٚنیٚ، ئەوەتا پلنگی دڕندە، ئاسکی هێدی و هێمنی بەگیرهێناوە، زولم و ستەم دەستدرێژی دەکاتە سەر تەخت و عەرشی بێگوناه و بیٚ دەسەلات. ئەی وێرانکاری، ئەی خوێن و مەرگ، ئەی قەتل و عام بەخێر بێن! کۆتایی هەموو شتێك دەبینم، هەر دەلێی نەخشەیەکە و لە بەردەمما دانراوە.

***دۆکبانۆ***: زۆرم بینی لە رۆژگاری نەعلەتی و پڕ لە قەرقەشەو هەروا وەهەنگامە! مێردەکەم لە پێناوی تاجدا، ژیانی خۆی دانا، کوڕەکانم هەورازو نشێوی زۆریان بینی سەرکەوتنیان بۆ من شادی بوو، و شکستیان فرمێسك و گریان، ئێستا کە کاروباران جێگیر بووەو ناکۆکی و دووبەرەکی نێو خۆیان، کۆنترۆلٚ کردووە، خۆ بەخۆ بەربوونەتە یەکتر. ئەوەتا برا دژمنی برای خۆیە، خوێن دژی خوێن وەستاوەو پیاو بەرانبەری پیاوی گرتووە! ئاه، ئەی کەلکەلەی ناماقۆلٚ و شێتانە، یاواز لە رق و کینەی خۆت بێنە، یا روحم دەربێنە با چیتر چاوم بە مەرگ نەکەویٚ!

شابانۆ ئەلیزابت: وەرە–وەرە کوڕەکەم، با پەنا وەبەر کلێسا بەرین، بە دوعا خانمەکەم.

***دۆکبانۆ***: پەلەمەکەن، منیش لەگەلتان دێم.

***شابانۆ ئەلیزابت***: تۆ پێویستت بە هاتن نیە.

---

[*] ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە دایکی پێی گوتووە.

***مەزنی ئوسقوفان***: بڕۆن خانمە میهرەبانەکەم، هەرچییەکتان هەیە لەگەڵ خۆتانی بەرن. منیش تەمغەو مۆرەکەی لای خۆمت دەدەمێ، هێندەی لە دەستم بێ، پەنا بە خوا، چاوم لە خۆت و کەسوکارت دەبێ چ دەبێ با ببێ. وەرن، دەتانبەم بۆ حەرەمی کڵێسا.

*(وەدەردەکەون).*

# فەسڵی سێیەم

## دیمەنی یەکەم

## لەندەن – شەقامێك

**( دەنگی شەیپور دێ – میری نەوجوان و دوك گلۆستەر و بکینگهام و کاردینالْ بورچیر، و کاتسبی و هەند یێکی دی وەژوور دەکەون ).**

***بکینگهام***: ئەی شازادەو میری نەجیب و خۆشەویست بەخێر بێی بۆ لەندەنی پایتەخت و مەنزڵ و هەواری خۆت.

***گلۆستەر***: بەخێربێی برازای ئازیزم، ئەی خەیاڵی بیرو هۆشم، وادیارە سەختی ڕێگا کاری تێکردوویت، بۆیە کەمێك خەمبار دەنوێنی.

***میر (شازادە):*** نەخێر مامە، ناڕەحەتیەکانی ڕێگا، کردیانە کارێك ڕێگە سەخت و ناخۆش بێ، بریا خاڵەکانم لێرەبان و پێشوازیان کردبام.

***گلۆستەر***: ئەی شازادەی ئازیز، تۆ هێشتا منداڵی و لە فڕو فێڵەکانی ژیان تێ نەگەییوی، تەمەشای رواڵەتی ئینسان دەکەی، ئینسان بە رواڵەتیا دەناسیت، رواڵەتیش –خوا دەیزانێ– بەدەگمەن لەگەڵ ناخ و دەروونندا یەك دەگرێ، بگرە هەرگیز یەك ناگرێ، ئەو خاڵانەی تۆ داوایان دەکەی و عەزرەتیان بۆ هەڵدەکێشیت خەتەر بوون، تۆ گوێت لە قسە لوسەکانیان بووە، ئاگاداری دڵی پڕ لە ژارو قاریان نەبووی. خوا لە شەڕی وان و دۆستانی درۆینەت بپارێزێ.

***شازادە (میر)***: خوا لەو جۆرە دۆستە درۆینانەم بپارێزێ! بەڵام من دۆستانی وام نەبوون، ئەوان واهی نەبوون.

***گلۆستەر***: قوربان، شارداری لەندەن بۆ عەرزی خێرهاتنی ئێوە تەشریفیان هێناوە.

***(شاردارو دارو دەستەکەی وەژوور دەکەون)***

***شاردار***: خواوەند سەلامەتی و شادی بە سەروەرمان عەتا بفەرمووێ!

***شازادە (میر)***: سوپاس لوردی ئازیز، سوپاس بۆ ئێوە هەمووتان، مەمنوونم، من بە تەمابووم دایکم و یورکی برام زووتر لێرەبان و لە پێشوازیم دا بان، هەر خۆت بە خۆت بی هیستینگزی تەمەڵ و تەوەزەل، هەر نەهاتی تا پێمان بڵێی کە دێن یان نا.

***(لورد هیستینگز وەژوور دەکەوێ).***

***بکینگهام***: ئەوا بە هانکە هانك هات، ئازای گیانی لە ئارەقەدا هەڵکشاوە.

***شازادە (میر):*** بەخێرهاتی جەنابی لۆرد، دایکم دێ یا نا؟

***هیستینگز***: شابانۆی دایکت و یورکی برات پەنایان وەبەر حەرەمی کڵێسا بردووە، خودا نەبیٚ کەس نازانیٚ بۆ ئەم کارەیان کردووە، شازادەی میهرەبان زۆری دڵ پێوە بوو لەگەڵ مندا بێتە خزمەتتان، بەڵام دایکی بەزۆر گلی دایەوە.
***بکینگهام***: بەخوا عەیبە! کەی ئەم رەفتارە دزێوە لەو دەوەشێتەوە، جەنابی کاردینال، ئاخۆ دەتوانی شابانۆ قاییل بکەی هەر ئێستا میر یورك بنێریٚ بۆ خزمەتی شازادەی برای. لۆرد هیستینگز تۆش لەگەڵیا بچۆ، ئەگەر شابانۆ قاییل نەبوو، بە تۆبزی لە باوەشی دەربێنەو لەگەڵ خۆتا بیهێنە.
***کاردینال***: قوربان، جەنابی لورد بکینگهام ، ئەگەر توانیم بە قسە میر یورك لە دەستی دایکی دەربێنم، ئەوا دوای تۆزێکی دی لێرەدا چاوت پێی دەکەویٚ، بەڵام ئەگەر بە قسەی نەرم و تکا نەهاتە ڕەدا، ئەوا خودا قەبوڵ ناکات دەست درێژی بکەینە سەر ئەو حەرەمە موبارەکە، من بەش بە حاڵی خۆم هەموو دنیام بدەنیٚ ئەو گوناحە گەورەیە ناکەم.
***بکینگهام***: قوربان تۆ لە ڕادەبەدەر ئینکاری، کەسێکی زۆر تەشریفاتی و کۆنەپەرستی. ئەگەر بەچاوی ئەم سەردەمەوە، بڕوانیتە مەسەلەکە، هەرگیز دەرکردنی دوك (یورك)ت لە کلیسا بە تەعەدا نەدەزانی. ئەم پەناگەو پەنانشینە موبارەکە هەمیشە هەقی ئەو کەسانە بووە کە کارو کردەوەیان شایستەی ئەم شوێنە بیٚ. یا هێندە زیرەك و لێزان بووبن کە ئەو هەقەیان بۆ خۆ داوا کردبیٚ. جا میر نە داوای ئەو هەقەی کردووە و نە کارێکی وەهای ئەنجامداوە شایستەی ئەو هەقە بیٚ، بۆیە بەڕای من ئەو هەقەی نیە، کەواتە تۆ هیچ هەق و هیچ حەرەمێك پیٚ شێل ناکەی ئەگەر لەو حەرمە موبارەکەی دەربێنی.
زۆرجار بیستوومە کە پیاوانێك پەنایان بردووەتە بەر حەرەمی کڵێسا، بەڵام تائێستا نەم بیستووە منداڵان ئەم کارەیان کردبیٚ.
***کاردنیال***: قوربان ئەمجارەیان دەم بەستت کردم. ئادەی لورد هیستینگز، لەگەڵم دێی؟
***هیستینگز***: بەڵیٚ ئەزبەنی، لەگەڵت دێم.
***شازادە (میر)***: لۆردانی هەژی، تا دەتوانن پەلە بکەن.
***(کاردنیال و هیستینگز وەدەر دەکەون)***
ئەریٚ مامە گلۆستەر، کە برایەکەم هات تا وەختی تاجگوزاریەکەی من لە کویٚ دانیشین؟
***گلۆستەر***: بە دڵی جەنابت، بەڵام ئەگەر بە قسەی من دەکەی، یەك دوو ڕۆژان لە بورج وەمێنە، ئیسراحەتیٚ بکە، و پاشان هەر شوێنێك ساغڵەمی و ئاسودەیی تۆ لە بار بوو، بۆ ئەوێندەر بگوازەوە.
***شازادە (میر)***: لە نێو هەموو شوێنەکاندا ڕقم لە بورجە. ئەریٚ گەورەم ڕاستە گوایە یولیوس قەیسەر دروستی کردووە؟
***بکینگهام***: بەڵیٚ، سەروەرم، ئەو دروستی کردووە، وپاشان نەوە دوای نەوە، نۆژەنیان کردووەتەوە،
***شازادە (میر)***: باشە، ئەمە وەکو حەقیقەتێك تۆمار کراوە، یا هەر دەماو دەم هاتووە؟

***بکینگهام***: تۆمار کراوە ئەزبەنی.

***شازادە (میر)***: بەڵام قوربان پێم وایە ئەگەر لە هیچ شوێنێکیش تۆمار نەکرابێ، حەقیقەت ون نابێ و دەماو دەم دێت و تا رۆژی قیامەت نەوە بۆ نەوەی دەگێڕێتەوە بە زندوویەتی دەمێنێتەوە.

***گلۆستەر***: (لەبن لێوانەوە) پەندی پێشینانە کە منداڵی بلیمەت زۆر ناژی.

***شازادە (میر)***: چ دەڵێی مامە؟

***گلۆستەر***: عەرزم کردی شکۆو شۆڕەت* ئەگەر تۆماریش نەکرێ هەر دەژی و دەمێنێ. ***(لەبەر خۆیەوە)*** ئە ئاوا بە وشەیەك دوو مانایان دەپێکم.

***شازادە (میر)***: یولیوس قەیسەر پیاوێکی بەناوبانگ بوو، هەم عەگید و دلێر بوو، هەم ژیرو ئاقڵ، دلێرییەکەی ژیرییەکەی بەرجەستە دەکرد و ژیرییەکەی دلێرییەکەی دەچەسپاند، مەرگ قارەمانیەتی ئەوی پێ ناسڕدرێتەوە، ئەوەتا هەر چەندە لە ژیاندا نەماوە، بەڵام بە شۆڕەت و ناوبانگ هەر زندووە، ئێ ئامۆزا بکینگهام!

***بکینگهام***: چی، ئەزبەنی؟

***شازادە (میر)***: ئەگەر بمێنم و گەورە ببم، هەقی کۆنی خۆمان لە فەڕەنسا دەکەمەوە، یان چۆن وەکو پاشایەك ژیام، وەکو سەربازێك دەمرم.

***گلۆستەر***: (لەبەر خۆوە) بەهاری زوو رەس، ، پێشەنگی هاوینی کورتە.

***(هیستینگز و کاردینالْ هاوڕێ لەگەڵ یورك دا وەژوور دەکەون).***

***بکینگهام***: ئەوە دوك یورك تەشریفی هێنا، بەڕاستی زووهات.

***شازادە (میر)***: ها ریچارد دوك یورك، چۆنی برای ئازیز؟

***یورك***: باشم، سەروەری خەمگینم، ئێستا دەبێ واهی گازت بکەم.

***شازادە (میر)***: بەڵێ برام، ئێمەش وەکو تۆ خەمبارین بە مردنی ئەو کەسەی کە شایستەی ئەم لەقەبە بوو، ئەم لەقەبە بە مردنی ئەو هەندێ لە شکۆی خۆی لە دەست دا.

***گلۆستەر***: وەزع و حاڵی برازایەکەم، دوك یورکی نەجیب لەچدایە؟

***یورك***: سوپاس، مامی میهرەبان و دڵسۆز. قوربان لەبیرتە دەتگوت گیاکەڵەی بێ سوود زووتر گەشە دەکات؟ خۆ ئەوە تا شازادەی برام لە من زووتر گەشەی کردووە و گەورە بووە.

***گلۆستەر***: بەڵێ، وایە ئەزبەنی.

***یورك***: یانی ئەو گیاکەڵەیە و بێ سوودە؟

***گلۆستەر***: من نابێ وا بڵێم، ئەی برازای ئازیزم.

***یورك***: کەواتە زیاتر حیساب بۆ دەسەڵاتی ئەو دەکەی تا من.

***گلۆستەر***: ئەو دەتوانێ وەکو پاشام ئەمرم پێ بکات، بەڵام تۆ وەکو پەیوەندی کەسایەتی کاریگەری و نازت بەسەرمەوە هەیە.

***یورك***: مامە تکات لێدەکەم ئەو خەنجەرەم بدەیە.

---

* ( شکۆو شۆڕەت دەژی و دەمێنێ ) گلۆستەر شکۆو شۆرەتی خۆی مەبەستە.

***گلۆستەر***: خەنجەرەکەی خۆم ئەی برازا چکۆڵەکەم؟ هەر تۆو خەنجەر.

***شازادە (میر)***: ئەوە چیە، دەرۆزە دەکەی برام؟

***یورك***: دەرۆزە لە مامی دڵسۆزو میرەبانم دەکەم، دەزانم دەمداتیٚ، ئەم خەنجەرە شتیٚك نیە پیاو بە بەخشینی ناڕەحەت بیٚ، یان لە دڵی دەرنەچیٚ.

***گلۆستەر***: دیارییەك لەو گەورەتر بە برازای خۆم دەدەم.

***یورك***: دیاریەکی گەورەتر لە خەنجەرەکەت! کەواتە شمشیٚرەکەشتم بدەیە.

***گلۆستەر***: ئەگەر هەندیٚ سووك بوایە دەمدایتیٚ برازای ئازیز.

***یورك***: وا دیارە تەنیا دیاری سووکت لە دەست دیٚ، هەر کەسیٚك داوای دیاری قورست لیٚبکا، دەست بە روویەوە دەنەی.

***گلۆستەر***: ئەم شمشیٚرە لەوە قورسترە بەتۆ هەڵگیریٚ.

***یورك***: خەمت نەبیٚ، چەند قورس بیٚ من هەر بە سووکی دەزانم.

***گلۆستەر***: چیە، بەڕاستی چەکەکەی منت دەویٚ میری چکۆڵە؟

***یورك***: بەڵیٚ، بۆ ئەوەی سوپاسیٚکت بکەم، هاوتای ئەو ناوە بیٚ کە تۆ لە منت ناوە.

***گلۆستەر***: چۆن؟

***یورك***: بچووك.

***شازادە (میر)***: مامە، لورد یۆرك هەمیشە لە قسە کردنا توڕەیە، هەڵبەتە تۆ تەحەمولی دەکەی.

***یورك***: مەبەستت ئەوەیە لە کۆڵم دەگریٚ نەك تەحەمولم دەکات. مامە برایەکەم بە هەردووکمان رادەبویٚریٚ، وا دەزانی، چونکە من وەکو مەیموون بچووکم، تۆ دەتوانی بمکەیە قەڵادۆشکان* و هەڵم بگریٚ.

***بکینگهام***: کە قسەزانیٚکی لەبلەبانی حازر وەڵامە! بە شیٚوەیەکی ئەوەندە جوان خۆی کرد بە مەیموون، تا مامی لە توانجەکانی نەڕەنجیٚ و تەحەمولی بکا.

***گلۆستەر***: ئەزبەنی، تۆ تەشریف نابەی؟ تا من و ئامۆزا بکینگهام دەچینە خزمەتی دایکتان و داوای لیٚدەکەین کە بیٚ بۆ بورج و لەویٚ خیٚر هاتننتان بکات.

***یورك***: چی؟ دەچییە بورجی گەورەم!

***شازادە (میر)***: جەنابی نایبی سەڵتەنەت وای بە پیٚویست دەزانیٚ.

***یورك***: من لە بورج دا خەوم لیٚ ناکەویٚ.

***گلۆستەر***: بۆچی؟ لە چی دەترسیت؟

***یورك***: بەزاتی مەریەمی پاکیزە لە روح و تاپۆی توڕەی مامە کلارنسم دەترسم، چونکە داپیرەم پیٚی گوتم کە لەویٚندەر کوژراوە.

***شازادە (میر)***: من لە مامە مردووەکانم ناترسم.

***گلۆستەر***: ئومیٚدەوارم لە مامە زندووەکانیش نەترسیت.

---

* ئەمە گاڵتە کردنە بە قەمووریەکەی گلۆستەر.

***شازادە (میر)***: ئومێدەوارم گەر تەمەن مەودای دان، ناچار نەبم لێیان بترسم، بەڵام ئێستا، جەنابی لۆرد کە بەرەو بورج دەڕۆم، یادی ئەوان دڵم دەگوشێت.

***(دەنگی شەیپور، هیستینگز و کاردینالْ هاوڕێ لەگەڵ هەردوو میردا (شازادە) وەدەردەکەون و گلۆستەر و بکینگهام و کاتسبی دەمێننەوە).***

***بکینگهام***: گەورەم، پێت وانیە ئەو یورکە منداڵە چەنەبازە، دایکە شەیتان و تەڵەکەبازەکەی رێی بۆ نەکێشابێ کە بەو شێوە حەیابەرەیە گاڵتە بە جەنابت بکا؟

***گلۆستەر***: بێگومان، بێگومان، ئاه! منداڵێکی خەتەرە، بە جورئەت، هوشیار، زیرەك، حازر وەڵام، نەترس، بوێر و بە توانا، کوت و مت خۆیەتی، سەراپا لە دایکی دەچێت.

***بکینگهام***: جارێ واز لەوان بێنە. کاتسبی وەرە، تۆ سوێندت خواردووەو سۆزت داوە کە هەر چیمان ویست بە قسەمان بکەیت و سرمان کەشف نەکەیت، بە خۆت لە رێگادا گوێت لە قسەکانمان بوو، و لە نیازمان تێ گەیشتی.تۆ بڵێی بتوانین قەناعەت بە لۆرد ولیام هیستینگز بکەین ورازی بێ بەوەی بە تەماین ئەم (شازادەیە) دوکە نەجیبە بکەین بە پاشای ئەم دورگە بەناوبانگە؟

***کاتسبی***: هیستینگز، خاتری بابی میری لەلای بوو، بۆیە میریشی بە هەمان ئەندازە خۆشدەوێ، مەحاڵە بە هیچ شێوەیەك بهێنرێتە رەداو دژی میر بوەستێ.

***بکینگهام***: ئەدی ستانلی؟ لەگەڵمان دەبێ؟

***کاتسبی***: رێك وەکو کاتسبییە، کاتسبی هەرچیەك بکات، ئەویش دەیکات.

***بکینگهام***: کەواتە جگە لەمە هیچ کارێکی دی ناکرێ. کاتسبی نەجیب، بڕۆ بۆ لای لورد هیستینگزو بە زمانی لوس و زیرەکانە قسەی لێ دەربێنەو بزانە کاردانەوەی بەرانبەر بە نیازەکەی ئێمە چیە. ئەوجا دەعوەتی بکە کە سبەینێ بێ بۆ بورج و لە کۆڕی ئەنجوومەنی تاجگوزاری دا بەشداری بکات. ئەگەر زانیت بەلای ئێمەدا دایدەکێشێ، ئەوا زیاتر هانی بدەو بەڵگەو بیانووەکانمانی بۆ روون بکەوە، خۆ ئەگەر ساردو سڕو بێ مەیل بوو، تۆش وەکو ئەو بەو چ قسەیەکی زیادی لەگەڵ مەکە، وەرەوەو نیازو مەبەستیمان بۆ بگێڕەوە، چونکە سبەینێ دوو کۆڕی جیاواز دەگرین، کۆڕێکی گشتی و کۆڕێکی تایبەتی* بۆ هەردوو کۆڕەکە زۆرمان پێویستمان بە تۆ دەبێ.

***گلۆستەر***: کاتسبی سڵاوم بە لورد ولیام بگەیەنە، پێی بڵێ سبەینێ لە قەڵای (پومفرت)دا لە سەری کۆنە دژمنە سەر سەختەکانی دەدرێ، پیرۆزبایی ئەو هەواڵە خۆشە لە هاوڕێکەم بکەو ماچێکی گەرمم بە خاتوو (شور) بگەیەنە.

***بکینگهام***: دەی کاتسبی ئازیز بڕۆ، زۆر ئاقڵانەو بە هێمنی ئەم کارە بکە.

***کاتسبی***: جووتە سەروەرم، بەوپەڕی وریایی ئەم کارە ئەنجام دەدەم.

***گلۆستەر***: بەر لە نووستن خەبەرەکەمان بۆ دێنێیەوە؟

---

* کۆڕە تا یبە تیەکە، پێچەوانەی کورە گشتییەکە دەبێ.

***کاتسبی:*** بەڵێ، جەنابی لۆرد.

***گلۆستەر***: ئێمە بە دوو قۆڵی لە (کرۆسپی پالاس) چاوەڕوانت دەکەین.

(کاتسبی وەدەردەکەوێ).

***بکینگهام***: ئەزبەنی جا ئەگەر لۆرد هیستینگز ملی نەداو بە دەنگمانەوە نەهات چ بکەین؟

***گلۆستەر***: جا ئەوە کەی موشکیلەیە کابرا، لە ملی دەدەین و بڕایەوە. کەی بووم بە پاشا هەنگێ دەتکەم بە ئیرلی (شەریف) هیر فۆرد و هەرچی ئەموالی مەنقولەی پاشای برام هەیە دەدرێ بە تۆ.

***بکینگهام***: جەنابی لۆرد، من جێبەجێ کردنی ئەم پەیمان و بەڵێنەم لە دەستانی ئێوە دەوێ.

***گلۆستەر***: بێ خەمبە، لە ناخی دڵمەو دەتدەمێ. جارێ وەرە با شیوەکەمان بخۆین، ئەوجا نەخشە و پلانەکانمان ڕێکدەخەین.

*(وەدەردەکەون).*

## دیمەنی دووەم

## بەردەم ماڵی لورد هیستینگز: کات شەوە

(لە دەرگا دەدرێ، پەیکێك وەژوور دەکەوێ، لەبەر دەرگا دەوەستێ).

***پەیك***: ئەزبەنی، ئەزبەنی! جەنابی لۆرد!

***هیستینگز***: (لە ژوورەوە) کێیە؟

***پەیك***: پەیکی لورد ستانلی-م.

***هیستینگز***: (لە ژوورەوە) سەعات چەندە؟

***پەیك***: نزیکەی چوارە.

***(هیستینگز دەرکە دەکاتەوە)***

***هیستینگز***: ئەوە چییە، جەنابی لۆرد ستانلی ناتوانێ بەم شەوە درێژانە بخەوێ؟

***پەیك***: پێدەچێ نەتوانێ، لەوەیە کە گوێت لە راسپاردەکانی ببێ، بە خۆت هۆی ئەم نیگەرانییەی بزانی، بەر لە هەرشتێك عەرزی سلاوی بۆ خزمەتت هەیە.

***هیستینگز***: چیتر؟

***پەیك***: عەرزی جەنابتانی دەکرد کە ئەمشەو خەونی دیتوە، لەو خەونەدا بەرازێك پڕی داوەتێ و کلاوخودەکەی لەسەر خستووەتە خوارێ. هەروەها دەڵێت سبەینێ دوو کۆڕ دەگیرێت، لەوەیە قەرارو بڕیاری یەکێك لەو دوو کۆڕو کۆبوونەوەیە ببێتە مایەی ژێوان بوونەوەی تۆو ئەو لەو بڕیارانەی کە لە کۆڕەکەی تردا دراون، جا بۆیەی ناردووم بۆ خزمەتی جەنابت، تا بزانێ ئاخۆ ئێوە ئامادەن بەپەلە بەگەڵی بکەون، و بە سواری ئەسپان بەرەو باکوور بڕۆن تا لەو خەتەرە دەرباز بن کە لە خەونەکەیدا پێشبینی کردووە!

***هیستینگز***: بڕۆ کابرا -بڕۆوە بۆ لای ئاغات، پێی بڵێ چ ترسێکی لەو دوو کۆبوونەوە جیاوازە نەبێ، ئێمە هەردووکمان لە کۆڕی یەکەمدا ئامادە دەبین، لەوی دیکەشدا کاتسبی، دۆستی دڵسۆزم ئامادە دەبێت، و هەر شتێك دەربارەی ئێمە بگوترێ، خێرا ئاگادارمان دەکاتەوە، پێی بڵێ ترسەکانی نابەجێیە و هیچ بنچ و بناوانێکی نییە، سەبارەت بە خەونەکەشی نابێ هێندە سافیلکە بێ کە باوەڕ بە زندە خەونان بکات، ئەم زندە خەونانە زادەی نیگەرانی و کەم خەوییە، هەڵاتن لەبەر بەراز بەر لەوەی بەرازەکە دووت بکەوێ، پتر جورئەتی لا دروست دەکات کەم راوت بنێ، ئەگەر پێشتر بە تەمای ئەم کارەش نەبووبێ، بڕۆ بە سەردارت بڵێ بلا ڕابێ و بێ بۆ لام تا پێکڤە بچینە بورجی، تا بە چاوی خۆی ببینێ کە بەرازە کە چەند دۆستانە ڕەفتارمان لەگەڵ دەکات.

***پەیك***: بەڵێ ئەزبەنی، دەچم و پەیامەکەی تۆی پێ دەگەیەنم. ***(وەدەر دەکەوێ).***

***(کاتسبی وەژوور دەکەوێ).***

***کاتسبی***: بەیانیت باش سەروەری نەجیبم!

***میستینگز***: بەیانیت باش کاتسبی. وا دیارە زوو لە خەو رابوویت، دەنگ و باس چیە؟ دەنگ و باسی دەوڵەتە لەرزۆکەکەمان؟

***کاتسبی***: ئەزبەنی، جەنابی لۆرد بەڕاستی دنیایەکی لەرزۆك و پەریشانە، پێم وایە هەرگیز ئارامی بە خۆیەوە نابینێ مەگەر (ریچارد) تاج لەسەر بنێ.

***میستینگز***: چۆن؟ تاج لەسەر بنێ؟ مەبەستت تاجی پاشایەتیە؟

***کاتسبی***: بەڵێ سەروەرم، جەنابی لۆرد.

***میستینگز***: ئەوەی راستی بێ من حەزەکەم لەسەرم بدرێ، و ئەوە نەبینم کە تاجەکە بەم شەرمەزاریە لەسەرێکی ناشایستە بنرێ، یانی تۆ پێت وایە کار بۆ ئەوە دەکات؟

***کاتسبی***: ئەرێ، بە گیانی خۆم کاری بۆ دەکات و زیاتریش حەزیش دەکات تۆش بەگەڵ دەستەوە بەستەکەی ئەو بکەوی، و هەڵبەتە قازانجیشت لەوەدایە، هەر بۆیەش ناردوومی کە مژدەت بدەمێ کە ئەمڕۆکە کەسوکاری شابانۆ، واتە دژمنەکانی تۆ، لە پۆمفرت دا دەکوژرێن.

***میستینگز***: پیاو راست بڵێ ئەم هەواڵەم پێ ناخۆش نییە، چونکە ئەوانە لە کۆنەوە و تائێستاش هەر دژمنی منن، بەڵام ئەوەی بەلای ریچاردا دایکیشم تا میراتگرانی جەنابی پاشا، لە هەقی رەوای عەرشداریان مەحروم بکەم! نە ء! خودا شاهیدە ئەگەر بشمکوژن کاری وام نەکردووەو نایکەم.

***کاتسبی***: هەر بژی بۆ خۆت و ئەمەکداریت جەنابی لۆرد، بەردەوام بە.

***میستینگز***: دەبینی ساڵ نابات، بەم چاوانە کارەسات و مسیبەتی ئەوانە دەبینم کە بۆ دژمنایەتی پاشایان هاندەدام، بزانە هەنگێ چۆن پێیان پێدەکەنم. کاتسبی، دەڵێم...

***کاتسبی***: دەڵێی چی ئەزبەنی؟

***میستینگز***: هەمووی دوو هەفتەی دی نابات، کەسانێك لە نێو دەبەم، بێ ئەوەی بەخۆ بزانن.

***کاتسبی***: قوربان، جەنابی لۆرد، زۆر ناخۆشە پیاو لە ناخافڵا بکوژرێ.

***میستینگز***: بەڵێ ناخۆشە، زۆریش ترسناکە! ئەمە لە ریڤەرزو ڤوگان و گرای دەقەومێ، هەروەها بەسەر خەڵکانێکی دیکەشدا دێ، کە وەکو من و تۆ، خۆیان لە هەر خەتەرو مەترسیەك بە دوور دەزانن و لەلای هەردوو میران، ریچارد و بکینگهام، خۆشەویستن.

***کاتسبی***: هەردوو میر، زۆر خاتری تۆ دەگرن و رێزی تایبەتییان بۆت هەیە. (لەبەر خۆیەوە) بۆیان داناوە چۆن سەری بە بەرزیەوە بە پردی لەندەنا هەڵواسرێ.

***میستینگز***: دەزانم، پیاوەتی خۆمەو شایستەی ئەو رێزو تەقدیرەم.

***(لورد ستانلی وەژوور دەکەوێ).***

وەرە، وەرە بەخێرهاتی ئەدی نێزەکەت کوا؟

تۆ لە بەرازەکێوی دەترسیت و بەبێ چەك دەسووڕێتەوە!

***ستانلی***: بەیانی باش جەنابی لۆرد، بەیانی باش کاتسبی، تۆ هەر لەسەر تەوس و توانجی خۆت بە، بەڵام قەسەم بە خاچی پیرۆز، من زۆر لەم دوو کۆبووەنەوە جیایە بە گومانم.

***میستینگز***: ئەزبەنی، منیش وەکو تۆ ژیانی خۆم خۆشدەوێ، دڵنیابە قەت رۆژێ لە رۆژان وەکو ئەمڕۆ ژیانی خۆمم مەبەست نەبووە، یانی پێت وایە ئەگەر لە پایەو دەسەڵاتی خۆمان دڵنیا نەبام، ئاوا بە کەیف وشاد دەبووم؟!

***ستانلی***: ئەو لۆردانەی کە هەنووکە لە زندانی پومفرت دان، ئەوانیش کە لە لەندەنەوە بۆ ئێرە وەڕێکەوتن، لە پایەو دەسەڵاتی خۆیان ئەرخایەن بوون، شادو بەکەیف بوون و چ شتێك نەبوو گومانیان لا دروست بکات. کەچی ئەوەتا بە خۆت دەبینی کە چۆن هەوری نەهامەتی لە پڕ دای بەسەریانا و رۆژی روناکی لێ تاری کردن. من لە خەنجەری بوغزی نامەردانە دەترسم، ئومێدەوارم ئەم ترسەی من ترسێکی نابەجێ بووبێ! دەی، ئەرێ نەچین بۆ بورج؟ وا رۆژ درەنگی کرد.

***میستینگز***: باشە با بڕۆین، ئەزبەنی دەزانی ئەو لۆردانەی کە باستکردن، ئەمڕۆ لە ملیان دەدرێ؟

***ستانلی***: ئەگەر بە دڵسۆزی بێ سەری ئەمان شایستەی مانە ئەوەی بە مەرگی تاوانبارکردوون شایستەی ئەوە نییە کلاوی ئەمان لەسەر بکات، بەڵام فەرموو ئەزبەنی بابڕۆین. ***(پەیکێکی فەرمی وەژوور دەکەوێ).***

***میستینگز***: تۆ لە پێشەوە بڕۆ با دوو قسان لەگەڵ ئەم کوڕە باشە دا بکەم ***(ستانلی و کاتسبی وەدەردەکەون)*** چیت پێیە کوڕۆ! لەگەڵ دنیادا چۆنی؟ کەیفت قنجە؟

***پەیك***: لە سایەی سەری تۆوە،کە جەنابت لە من دەپرسیت، ئەمە ئەوپەڕی باشیە بۆ من.

***میستینگز***: جا با باسی خۆمت بۆ بکەم، ئێستا زۆر لەوسا باشترم کە دوا جار یەکمان بینی، ئەوسا بە فیتی دەستەو بەستەی شابانۆ بەرەو زندانی بورج دەبرام، بەڵام ئێستا قسەیەکت پێ دەڵێم تکایە هەر بەینی خۆمان بێ، ئەو دژمنانە ئەمڕۆ ئیعدام دەکرێن، بۆیە قەت لە ئێستا باشتر نەبووم...

***پەیك***: خوا بە دڵی خۆتان لەگەڵ بکات سەروەرم.

***میستینگز***: زۆر سوپاس کوڕی باش، هانێ بڕۆ بە سەلامەتی من بادە بنۆشە. ***(کیسەیەکی بۆ هەڵدەداو وەدەر دەکەوێ).***

***پەیك***: خودا سەروەرم لە بەڵا بەدوورکا، (ئەو وەدەردەکەوێ، قەشەیەك وەژوور دەکەوێ)

***قەشە***: مەرحەبا قوربان، بە دیتنی جەنابت خۆشحاڵم.

***میستینگز***: لە کانگای دڵەوە سوپاست دەکەم (سێر* جون)، من قەرزارباری ئەو دوا سرووتانەم کە ئەنجامت دان، شەممەی ئایندە سەر بدەوە رازیت دەکەم.

***(بە گوێی دا دەچپێنێ)***

***قەشە***: لە خزمەتودام.

***(بکینگهام وەژوور دەکەوێ).***

* لەقەبی سێر لەو سەردەما نەدا بە کەسانێك دراوە کە لە واری زانستێن ئایینی دا کارنامەی بەرزیان هەبووە.

**بکینگهام**: چی! مەزنی رازگرانی کۆشك، قسان بۆ قەشە دەکا؟ ئەو دۆستانەی پومفرتت پێویستیان بە قەشەیە، تۆ گەورەم، جارێ پێویستت بە ئیعتراف نیە.

**میستینگز**: راست دەکەی، باوەڕ بکە کاتێ ئەم قەشەیەم بینی، ئەو پیاوانەم بیرکەوتنەوە کە تۆ باسیان دەکەی، دەچییە بورجێ؟

**بکینگهام**: بەڵێ، جەنابی لۆرد، بەڵام زۆر لەوێ نامێنمەوە، بەر لە تۆ دەگەڕێمەوە[**].

**میستینگز**: من، نەك هەر زۆر لەوێ دەمێنمەوە، لەوەیە بۆ فراڤینیش لەوێ بمێنمەوە.

**بکینگهام**: (لەبەر خۆوە) بۆ شیوش دەمێنێییەوە ئەگەرچی نایزانی، (بە دەنگەوە) ئێستا دەڕۆی؟

**میستینگز**: بەڵێ، لە خزمەتی تۆدا دێم.

---

[**] ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە هەرگیز ناگەڕێتەوە.

# دیمەنی سێیەم

## قەڵای پۆمفرت: Pomfret

**( سێر ریچارد راتکلیف وەژوور دەکەوێ، و چەند نێزە دارێك، ریڤەرز، گرای و ڤوگان بەرەو مەرگ وەپێش دەدەن ).**

***راتکلیف***: ئادەی –زندانیەکان بێنن.

***ریڤەرز***: سێر ریچارد راتکلیف، باپێت بڵێم، تۆ ئەمڕۆ مەرگی هاوولاتییەك، مەرگی یەکێك لە دەستوپێوەندانی شا دەبینی، کە تەنیا لەبەر دڵسۆزی و هەقپەروەری و گوێڕایەڵی دەکوژرێ.

***گرای***: خودا (میر – شازادە) لە شەڕی ئێوە بپارێزێ، چونکە ئێوە تاقمێکی مەلعونی خوێن مژن.

***ڤوگان***: رۆژێ دێ پەنجەی پەشیمانی دەگەزی و فرمێسکی نەدامەت دەرێژی.

***راتکلیف***: خێراکەن! رۆژی ئێوە تەواو بووەو ئەجەلتان هاتووە.

***ریڤەرز***: ئەی پومفریت! ئەی پۆمفریت! ئەی زندانە خوێناویەکە، ئەی مەڵبەندی شوم و نەحسی، ئەی تالوکەگای نەجیمزادەو خانەدانان! لە ناو چوار دیواری پڕ تاوانی تۆدا ریچاردی دووەم بە شمشێران لەت و پەت کرا، ئەوا ئێمەش خوێنی پاکی خۆمانت دەدەینێ تا بیخۆیەوە، و هێندەی دی لە نێو خەڵکیدا بەدناو ببی.

***گرای***: تووك و نەفرەتی (مارگرێت) مان لێگیرا بوو، نەفرەتی ئەو گرتوومانی، چونکە کاتێ ریچارد بە بەرچاوی هەموومانەوە کوڕەکەی بەر خەنجەران داو، ئەو هاواری بۆ هیستینگز، بۆ تۆ، و بۆ من هێنا، شتاقمان لە جێی خۆ نەجوڵاین و زەق زەق تەمەشامان دەکرد.

***ریڤەرز***: نەفرەت و تووکی لە هیستینگز، ئەوجا لە ریچارد و پاشان لە بکینگهام–ش کرد، دەی سا خودایا، ئاهوونزولەی مارگرێت ئەوانیش بگرێ، وەکو چۆن ئێمەی گرت. ئەی خوای دەهەندە و دلۆڤان، با خوێنی ئێمە، ئەو خوێنەی کە بە خۆت ئاگاداری بەبێ تاوان دەرێژرێ، ببێ بە کەفارەتی خوشکەکەمان و دوو کوڕە شازادەکەی.

راتکلیفك دەی خێراکەن، رۆژتان تەواو.

***ریڤەرز***: وەرە گرای، وەرە ڤوگان با دەست لە ملی یەکدی بکەین با دوعاخوازی لێکدی بکەین، تا لەو دونیا، لە بەهەشت بە یەکدی دەگەینەوە.

***(وەدەردەکەون).***

## دیمەنی چوارەم

## بورجی لەندەن

**(بکینگهام، داربی، هیستینگز، ئوسقوف ئیلی، راتکلیف و لوڤل و هەند یکی دی وەژوور دەکەون، و لە دەوری مێزێك دادەنیشن).**

***هیستینگز***: بەڕێزان، با بە پەلە بێینە سەر باسەکەمان، ئێمە بۆیە لێرە کۆبووینەتەوە، تا رۆژی تاجگوزاری دیاری بکەین، جا ناوی خوای لیٚ بێنن و پێمان بڵێن ئەو رۆژە بەشکۆیە کەی بیٚ؟

***بکینگهام***: باشە هەموو شتێك بۆ ئەو رۆژە بە شکۆیە سازدراوە؟

***داربی***: هەموو شتیٚ ئامادەیە، تەنیا ئەوە ماوە رۆژەکە دیاری بکەین.

***ئیلی***: پێم وایە سبەینیٚ رۆژێکی موبارەکە.

***بکینگهام***: کیٚ لێرە رای جەنابی لۆرد وەسی دەزانیٚ؟ کێتان لە میری نەجیبەوە نزیکترە؟

***ئیلی***: پێم وایە جەنابت لە هەمووان باشتر رای ئەو دەزانی.

***بکینگهام***: کیٚ! من دەڵێی ئەزبەنی؟ ئێمە روو و رواڵەتی یەکدی دەناسین، بەڵام سەبارەت بە دڵ و دەروونمان، من چەند ئاگام لە دڵی تۆیە، ئەویش هەر ئەوەندە ئاگای لە دڵی منە، هەروەها چەند تۆ ئاگات لە دڵی منە، منیش هەر ئەوەندە ئاگام لە دڵی ئەوە، لورد هیستینگز، تۆو ئەو دوو دۆستی نزیکی یەکترن.

***هیستینگز***: من مەمنونی لوتف و مەحەبەتی ئەوم، من دەزانم کە خۆشی دەوێم، بەڵام سەبارەت بە رۆژی تاجگوزاری نە من هیچم لیٚ پرسیوە، و نە جەنابیشی باسی کردووە. بەڵام ئێوە، ئەی نەجیمزادەو خانەدانانی هەژی دەتوانن رۆژەکە دیاری بکەن، من لە بری جەنابی دۆك رای خۆم دەردەبڕم و پێم وایە ئەویش لوتف دەکات و بە رایەکەی من قایبل دەبیٚ.

***(گلۆستەر وەژوور دەکەویٚ)***

***ئیلی***: ئەوا جەنابی میر (دۆك) بە خۆی و لە کاتی خۆیدا هات.

***گلۆستەر***: ئەی لۆردانی هەژی، خزمان و پسمامان بەیانی هەموو لایەکتان باش، ببورن لە خەو مابووم، بەڵام ئومێدەوارم دواکەوتنی من نەبووبێتە هۆی باس نەکردنی هەندیٚ کاروباری گەورەی ئەوتۆ کە ئەگەر من ئامادەبووام، لەوە بوو ئەنجام بدریٚ.

بکینگهام: ئەزبەنی، ئەگەر یك تۆزی دی ماتەڵ بای، ئەوا ویلیام لۆرد هیستینگز هەڵوێستی جەنابتی راگەیاندبوو، یانی رای جەنابتی، لەمەڕ مەسەلەی تاجگوزاری پاشا، راگەیاند بوو.

***گلۆستەر***: مەحاڵە کەسێکی ئازاتر لە لۆرد هیستینگز پەیدا ببیٚ، جەنابی زۆر چاکم دەناسێت و لە ناخی دڵەوە خۆشی دەوێم.

***هیستینگز***: سوپاس، گەورەیی خۆتانە.

***گلۆستەر***: لورد ئیلی.

***ئیلی***: گەورەم؟

***گلۆستەر***: کە دواجار لە هولبورن بووم، شاتۆی چاکم لە باخەکەتا بینی، نا نێری تۆزێکمان بووبێ.

***ئیلی***: هەر تۆو شاتوو، وەی بەسەر چاو، قەسەم بە مەریەمی پاکیز، لە ناخی دڵەوە ئەم کارە دەکەم.

***(وەدەر دەکەوێ).***

***گلۆستەر***: ئامۆزا بکینگهام، قسەیەکم پێتە. ***(دەیباتە سوچێکەوە).*** کاتسبی سەبارەت بە نەخشەکەمان قسەی لەگەڵ هیستینگزدا کردووە، کابرای تاین زۆر تورە بووەو گوتوویەتی ئامادەیە سەری دابنێ، بەلام بەوە رازی نابێ کە کورەکەی پاشای سەروەری، کە زۆر بە حورمەتەوە ناوی دەبات، عەرش و تەخت و تاجی ئینگڵتەرا لە دەست بدات.

***بکینگهام***: ئەزبەنی تۆ تۆزێك تەشریف بەرە دەرێ، و منیش بە دواتا دێم.

***(گلۆستەر و بە دوایا بکینگهام وەدەردەکەون)***

***داربی***: هێشتا رۆژی جەژنەکەمان دیاری نەکردووە، بەرای من سبەینێ زۆر زووە، من وەکو پێویست خۆم بۆ ئامادە نەکردووە، ئەگەر تۆزێ دوا بخرایە، ساز دەبووم.

***(ئوسقوف ئیلی دەگەرێتەوە)***

***ئیلی***: ئەوە جەنابی لۆرد دوك گلۆستەر کوا؟ ناردم بۆ شاتووەکە.

***هیستینگز***: جەنابی، وا دیارە ئەمرۆ زۆر شادو بەکەیفە، جۆری سلاوکردنەکەی لە ئێمە بەو هەموو گەشی و رووخۆشییەوە، نیشانەی ئەوەیە کە بیرێك یان شتێکی دیکە زۆر خۆشحاڵی کردووە. باوەر ناکەم لە جیهانی مەسیحیەتدا کەسێك هەبێ کە بتوانێ خۆشەویستی یا رقی خۆی وەکوئەو بەزەحمەت بشارێتەوە، پیاو دەتوانێ بە تاقە نیگایەکی سیمای پەی بەرازو نهێنی دڵی ببات.

***داربی***: باشە لە سیمای شادی ئەمرۆیدا چ رازێکی دڵیت خوێندەوە؟

***هیستینگز***: ئەلهەقی لە هیچ کەسێکی ئێرە دڕدۆنگ نییە، ئەگەر لە کەسێك پەست بوایە، بە سیمایەوە دەردەکەوت،

***داربی***: یاخوا وابێ، لە کەس دڕدۆنگ نەبێ.

***(گلۆستەر و بکینگهام دەگەرێنەوە، خەمینییەکی سەیر لە سیمای گلۆستەر نیشتووە، برۆی ویکدێنێتەوەو لێوان دەکرۆژێ).***

***گلۆستەر***: تو شەرەفتان ئێوە بیڵێین، سزای ئەوانە چییە کە پیلان بۆ کوشتنی من دادەنەن، و دەیانەوێ بە شێوازی ئەهریمەنانەی سیحر ئامێزی قێزەون زەفەرم پێ بەرن و جەستەم عەیبدار بکەن؟

***هیستینگز***: ئەزبەنی، جەنابی لۆرد، من بە حوکمی ئەو خۆشەویستییەی دەرهەق بە سەروەرتان هەمە، بە پێویستی دەزانم لە حوزوری ئەم نەجیمزادانەدا قسەی خۆم بکەم: من بەش بە حاڵی خۆم ئەوانە هەر کێیەك هەن، بە تاوانباریان دەزانم، و بە راشکاوی دەیڵێم کە شایستەی ئیعدامن.

***گلۆستەر***: کەواتە بڕوانە چییان بەسەر هێناوم، بزانە چ جادوویەکیان لێکردووم! تۆ سەرنجی باسکم بدەو بزانە چۆن وەکو لقە دارێکی وشکەوە بووی بەر ڕەشەبای لێهاتووە، ئەمە ئیشی ژنەکەی ئیدواردە، ئەو سیحربازە ترسناکە پڕ خەتەرە، ئیشی ئەوو ئەو (شور)ە سۆزانیەیە.

***هیستینگز***: سەروەری میهرەبانم، جەنابی لۆرد، ئەگەر ئەوان ئەم کارەیان کردبێ،

***گلۆستەر***: ئەگەر! ئەگەر! تۆ، ئەی دالّدەو پەنای ئەم سۆزانیە نەفرەتیە، بە من دەڵێی (ئەگەر)؟ تۆ خاینی، ئادەی لە ملی بدەن، قەسەم بە پۆڵسی موبارەك نیوەڕۆژە ناکەم تا سەری بڕوای نەبینم! ئادەی لوڤل، راتکلیف ئەم ئەمرە جێبەجێ بکەن، دەی ئێوەش کێ منی خۆش دەوێ، هەستێ و دوای من بکەون.

***(هەموو وەدەردەکەون تەنێ لوڤل و راتکلیف و هیستینگز نەبێ)***

***هیستینگز***: حەیف، سەد حەیف و مەخابن بۆ ئینگلّتەرا، نەك بۆ من، کە شایستەی یەك زەڕە حەیف نیم! چونکە من ئەگەر ئەوەندە کەودەن نەبام، دەمتوانی دەرباز ببم، ستانلی لە خەویا بەرازە کێوی دیتبوو، و کلاّوخودەکەی لەسەر خستبووە خواری! بەلاّم من گاڵتەم بە خەونەکەی کردو هەلاّتنم پێ شەرم بوو، ئەمڕۆ ئەسپەکەم، کە چاوی بە بورجەکە کەوت سێ جاران خزی، و ڕەوییەوە، دەتگوت نایەوێ بەرەو کوشتارگەم بێنێ، ئا ئێستا پێویستم بەو قەشەیەیە کە قسەی لەگەڵ کردم، ئا ئێستا پەشیمانم لەوەی کە بە زمانی سەرکەوتوویەکی زۆر سەرکەوتوو بەسەر دژمنەکانیا، بە پەیکە فەرمیەکەم وت چۆن ئەمڕۆکە لە پۆمفریت دا دژمنەکانم دەکوژرێن، و منیش لە سایەی لوتف و مەحەبەتدا، دڵڕەخت و ئاسودە خەیاڵ دەمێنم، ئاه، ئەی مارگرێت، ئەی مارگرێت، هەنووکە تووك و نەفرینی قورسی تۆ بەسەر سەری هیستینگزی کڵۆڵ و داماودا داباری.

***راتکلیف***: قوربان پەلەکەن کاتی نیوەڕۆژەی لوردە، درێژەی بە ئیعترافەکەت مەدە، چونکە لورد دۆك گلۆستەر ئارەزوومەندی دیتنی سەری تۆیە.

***هیستینگز***: ئەی دنیا، ئەی نازو نیعمەتی فانی! ئەی نازو نیعمەتی بەشەرانی فانی. ئێمەی بەشەر کە ئەوەندە لە دوی تۆین، لە دووی ڕەزامەندی و مەرحەمەتی خودانین! هەر کەسێك کۆشکی هیواو ئاواتان لەسەر بناخەی ڕواڵەتی جوانی بەشەران بنیاد بنێ وەکو دەریاوانێکی مەستی مەستە، هەر شەپۆل و لەرەیەك دەتوانێ تورِی بداتە هەناوی کوشندەی دەریاوە.

***لوڤل***: خێراکە خێرا! هاوارو سکالاّ بێهودەیە!

***هیستینگز***: دنیا! ئەی ریچاردی خوێنرێژ! ئەی ئینگلّتەرای نەگبەت و بەدبەخت! پێشبینی شوومترین دەوران و چارەنووسی دنیای پڕ وەیشومەتان بۆ دەکەم. دەی بمبەن بۆ سەر مشەمای سەربڕین و سەرم هەڵگرن و بۆ دۆکی بەرن، ئەوانەی بە من پێدەکەنن، بە خۆشیان بەو زووانە دەمرن.

***(وەدەردەکەون).***

## دیمەنی پێنجەم

## شورەکانی بۆرج

**( گلۆستەر و بکینگهام وەژوور دەکەون، زرێی کۆنیان پۆشیوەو زۆر پەریشان و نارەحەتن )**

***گلۆستەر***: ئەریٚ ئامۆزا، تۆ ناتوانی بە درۆوە لەرز لە خۆت بێنیٚ، و رەنگ و رووت زەرد بنوێنیٚ، و وا خۆت دەر بخەی کە بە دەم قسە کردنەوە هەناسەت سوار بووبیٚ؟ ئەوجا دەست بە قسان بکەیەوەو هەمدیس قسەکەت ببڕی، وەك ئەوەی لە ترسا شپرزەو شێت بووبی؟

***بکینگهام***: هەقت نەبیٚ، دەتوانم لاسایی لێهاتووترین ئەکتەری تراجیدیا بکەمەوە، قسان دەکەم، ئەوجا ئاوڕی پاشەوە دەدەمەوە، بەڕاست دا، بە چەپدا هەڵدەڕوانم، ئەوجا لەرز لە خۆ دێنم، لە کەوتنە خوارەوەی پوشکەیەك دەڕەومەوە، گومانێکی زۆر لە خۆ دێنم. نە لە نیگای ترسناکم کەمەو نە لە بزەی درۆو دەستکرد، لە هەر شوێن و لە هەر کاتێکا بمەویٚ نەخشەو پیلانە فێڵاویەکانم ئەنجام بدەم، هەموو ئەو بەهرانەم لە خزمەتدان، ئەریٚ کاتسبی رۆیی؟

***گلۆستەر***: بەڵیٚ رۆییوە، ئەوەتا وا لەگەڵ شاردارا دێتەوە.

***(شاردار هاوڕیٚ لەگەڵ کاتسبی دا وەژوور دەکەویٚ)***

***بکینگهام***: جەنابی شاردار.

***گلۆستەر***: تەماشای پردە سەیارەکە بکەن.

***بکینگهام***: گویٚ بگرە! دەنگی دەهۆڵە؟

***گلۆستەر***: کاتسبی، لەسەر دیوارەکانەوە تەمەشا بکە.

***بکینگهام***: جەنابی شاردار، بۆیە بە شوێنمانا ناردووی کە..

***گلۆستەر***: بڕوانە پاش خۆت! ئاگات لە خۆ بیٚ! دژمن گەیینە سەرمان!

***بکینگهام***: ئومێدەوارم خوا ئاگادارمان بیٚ، و پاکی و بێگوناهی خۆمان بمانپارێزیٚ.

***گلۆستەر***: سەبرکە، خۆ دۆستانی خۆمانن، (راتکلیف و لوڤل)ن.

***(لوڤل و راتکلیف سەر ی هیستینگزیان پێیەو وەژوور دەکەون).***

***لوڤل***: ئەمە سەری ئەو خاینە دڵڕەشەیە، هیستینگز، ئەو دژمنە ترسناکەی کەس گومانی لێنەدەکرد.

***گلۆستەر***: هەستدەکەم گریانم دیٚ، بەڕاستی زۆرم خۆش دەویست. وامدەزانی راستگۆترین کەسی سەر رووی زەمینە، دوورترین مەسیحییە لە هەر بەدنیازی و بەدکارییەك، کردبووم بە تۆماری هەموو نهێنییەکانی روحی خۆم، کردبووم بە مەحرەمی رازەکانم، ئەی ئافەرین بۆ خۆت و زیرەکیت، هێندە زیرەکانە عەیب و عارو پۆخڵەواتەکانی بە پەردەی فەزیڵەتفرۆشی داپۆشی بوو، تەنانەت تاوانە زەقەکەشی، واتە پەیوەندیی دەگەڵ ژنەکەی (شور)ش دا، داپۆشی بوو، دوور لە هەر پەڵەیەکی نەنگینی گومان ژیا.

***بکینگهام***: تەحا کە خاینێکی سڕ قایم و مەنگ بوو. ئەگەر خوا بە گەورەیی خۆی نەیپاراستباین، و ئێمە نەمابایﻥ تا ئەم سڕەی ئەم خاینە زرینگەت بۆ کەشف بکەین، ئایا تەسەورت دەکرد یان باوەڕت دەکرد کە ئەم خاینە زرینگە پیلانی بۆ من و جەنابی لۆرد گلۆستەر دانا بوو کە ئەمڕۆ لە بارەگای کۆبوونەوەکەدا هەردووکمان بکوژێت؟

***شاردار***: چی! شتی واشی لە ژێر سەرا بووە؟

***گلۆستە***ر: پێت سەیرە! چما لات وایە ئێمە ترک یا گاورین، ئەگەر لە ترسی خەتەری پیلانەکەو لەبەر خاتری پاراستنی سەلامەتی ئینگلتەڕاو گیانی خۆمان نەبوایە، لە خۆڕاو بەو پەلە پەلە، و بێ گەڕانەوە بۆ قانون، دەست پێشکەری بکەین و ئەو غەددارە بکوژین؟

***شاردار***: خوا جەزاتان بداتەوە! بە راستی مەرگی خۆی حەڵاڵ کردووە، قوربان کارێکی چاکتان کرد، کە کردتان بە پەندو عیبرەت بۆ هەر خاینێکی کەڵەکبازی دیکە.

***بکینگهام***: ئەوی راستی بێ، لەوساوە کە دەستی دەگەڵ ژنەکەی شوردا پەیدا کرد، ئیدی هیچ ئومێدێکم پێی نەماو لەوەش باشترم لێ چاوەڕوان نەدەکرد، لەگەڵ ئەوەشا بە تەما نەبووین بەر لە هاتنی جەنابت بیکوژن، ئیدی چ بکەین، دڵسۆزی ئەم دوو برادەرەمان، وای لێکردن پەلە لە کوشتنی بکەن، هەر چەند ئێمە ئەم پەلەیەمان پێ باش نەبوو، چونکە حەزمان دەکرد بەخۆت گوێت لە ئیعترافە ترسنۆکانەکانی بوایە کە چۆن ویستویەتی شێوازی خیانەتکارانەی خۆی بەکار بێنێ و مەبەستی لەو خیانەتکارییە چ بووە، تا، وەکو خۆی بۆ خەڵکی شاری بگێڕیتەوە، و خەڵکی ئەم کارەمان بە خراپی لێك نەدەنەوەو پرسەی بۆ نەگرن و بە مەرگی ئەم خاینە خەمبار نەبن.

***شاردار***: بەڵام قسەکەی تۆ هەموو شتێکە جەنابی لۆرد، نە پێویستم بە دیتنی هەیەو نە بە بیستنی ئیعترافەکانی، جا من لەلای خۆمەوە، ئەزبەنی کارێکی وا دەکەم کە هەموو خەڵکی شار لە رەفتاری دادپەروەرانەت دەرهەق بەم بابەتە، تێ بگەیەنم و ئاگادار بکەم.

گلۆستەر: جا ئێمەش بۆیە حەزمان دەکرد جەنابت ئامادە بی، تا لە لۆمەو گازاندەی خەڵکی بە دوور بین.

***بکینگهام***: هەر چەندە درەنگ هاتی و فریا نەکەوتی، بەڵام لەنیازو مەبەستمان حاڵی بوویت و ئەمە بە خەڵکەکە رابگەیەنە، جا ئێستا تۆ بڕۆ جەنابی شارداری بەڕێز، خوا حافیزت بێ.

***(شاردار وەدەردەکەوێ).***

***گلۆستە***ر: بڕۆ، دوای کەوە ئامۆزا بکینگهام، دوای بکەوە، هەر ئێستا دەڕوات بۆ ئەنجوومەنی شار، جا خۆت بگەیەنە ئەوێندەر و لەوێ فرسەت بێنە، هێندەی دەتوانی مەسەلەی حەرامزادەیی منداڵەکانی ئیدوارد بێنە ئاراوە، گومان بخەرە سەر حەڵاڵ زادەییان، ئەوەش لە نێو خەڵکەکەدا بڵاوبکەرەوە کە ئیدوارد هاوشارییەکی خەڵکی شاری، تەنیا لەبەر ئەوە ئیعدام کردبوو کە گوتبووی کوڕەکەی دەکاتە میراتگری تاج*، لە راستیا مەبەستی ماڵەکەی خۆی بوو بوو کە

---

* لەو سەردەما نەا هەر ماڵێك لەبری ژمارە نیشانەیەکی پێوە بووە، د یارە لێرەدا تاج نیشانەی ئەو ما ڵە بووە، نەك رەمزی تەخت و تاجی پاشایەتی.

نیشانەی تاجی پێوە بوو بوو. ئەوجا وەرە سەر باسی کۆڕی عەیش و نۆش و رابواردنە قێزەون، و داوێن پیسییە حەیوانییەکانی، کە کارەکەرو کیژۆ ژنانی خەڵکی شارەکەی نەدەبوارد، بۆیان باس بکە کە چۆن چاوانی شەهوەتڕان و دڵە هۆڤیەکەی ئیدوارد لە نێو ئەوانەدا، بێ ئەوەی کۆ لە هیچ بکاتەوە، هەمیشە خەریکی راوی خۆی بوو و بۆ نێچیری تازە دەگەڕا، خۆ ئەگەر ناچار بوویت و پێویستی کرد، بۆ ئەوەی بێیتە سەر باسی من، ئەوا باسی من بکەو بڵێ: وەختێ دایکم ئەو شیر حەرامی چڵێسەی، ئیدواردی بوو، بابم، میر یورك، لە فەرەنسادا سەرگەرمی جەنگ بووە، و جا کە بابم بە وردی رۆژو مانگی حەملەکەی حیساب کردووە، بۆی دەرکەوتووە کە ئەو منداڵە لەو نییە، ئەم گومانەش لە سیماو رواڵەتی ئیدواردا، کە هەرگیز لە میری نەجیب، بابم نەدەچوو، ئاشکراو دیار بوو، بەڵام وریابە دەبێ زۆر بە نەزاکەت و لام سەر لایی باسی ئەم بابەتە بکەیت و وا بنوێنی لەو کاتەدا خۆ بەخۆ و بە شێوەیەکی رەوتەنی بە بیرتا هاتووە، چونکە حەنابی لۆرد بە خۆت دەزانی دایکم هێشتا لە ژیاندایە.

***بکینگهام***: هیچ خەمت نەبێ، گەورەم، بۆت دەبم بە خەتیب و وتاربێژێکی وەها وەك ئەوەی ئەو خەڵات وتاجە ئاڵتونیەی بۆ تۆی داوا دەکەم، بۆ خۆم بێ، جارێ خوا حافیز ئەزبەنی.

***گلۆستەر***: جا کە لە کارەکەت بویتەوەو سەرکەوتی، ئەوا بیان هێنە بۆ کۆشکی (بینارد – Baynard Castle) منیش لەگەڵ دوو قەشە بەڕێزەکە و کۆمەڵێك ئوسقوفی زانادا لەوێ دەبم.

***بکینگهام***: من ئێستا دەڕۆم، نزیکەی سەعات سێ یان چوار هەواڵی کۆڕەکەی ئەنجوومەنی شارت بۆ دێنم.

***(وەدەردەکەوێ)***

***گلۆستەر***: لوڤل، تۆ بە پەلە بچۆ بۆ لای (دکتۆر شۆ)، ***(روو دەکاتە کاتسبی)*** تۆش بڕۆ بۆ لای بابە پنکر، بە هەردووکیان بڵێن بەر لەو سەعاتە، لە کۆشکی بینارد حازر بن و بم بینن. ***(جگە لە گلۆستەر هەموو وەدەردەکەون).***

با خێرا وەخۆ بکەوم، تەگبیرێکی نهێنی بکەم و مناڵەکانی (کوڕو کچەکەی) کلارنس لەم شوێنە دوور بخەمەوەو فەرمانێك دەربکەم کە هیچ کەسێك، لە هەر پلەو پایەیەکدا بێ، بۆی نییە پەیوەندی بەو میرزادانەوە بکات و بیان بێنێ.

***(وەدەردەکەوێ).***

## دیمەنی شەشەم

## هەمان دیمەن – شەقامێك

( **كاتبێك وەژوور دەكەوێ، كاغەزێكی بە دەستەوەیە** )

***كاتب***: ئەمە تاواننامەكەی لۆرد هیستینگزی پیاو چاكە، كە بە خەتێكی خۆش و جوان نووسیومەتەوە تا ئەمڕۆ لە كلێسای سەنت پۆڵس بخوێنرێتەوە. تۆ تەماشا چەن جوان هەڵبەستراوە، ئەوەیە چیرۆك! بە یازدە دانە سەعات ئەوجا نووسیمەوە، چونكە كاتسبی دوێنێ شەو بۆی هێنام. داڕشتنی نووسخە ئەسڵییەكەشی هەمان كاتی برد. لەگەڵ ئەوەشدا لۆرد هیستینگز بە پێنج سەعاتێك بەر لە هۆنینەوەی ئەم چیرۆكە لە ژیاندا بوو، ئازادو سەرفراز كەس تاوانباری نەدەكرد، چ ژیانێكی خۆش بوو! كەچی لە عەرزی ئەم پێنج سەعاتەدا! بەڵێ! ئەوە دنیایە! جا چ ئەحمەقێك هەست بەو فێڵ و دەهۆیە ناكات و نایبینێ؟ بەڵام چ كەسێك دەتوانێ و قیروسیا لە گیانی خۆی بكات و بڵێ هەستی پێدەكات و دەیبینێ؟ ژیان بۆ خۆی پڕ لە گۆبەنگ و پوچە! جا وەرە خەڵكیش چاوپۆشی لەو رەفتارە نەنگینە بكەن! دەبێ چی تیا بمێنێتەوە!.

## دیمەنی حەوتەم

## کۆشکی بینارد

**( گلۆستەر و بکینگهام، لە دوو دەرگای جیاوازەوە وەژوور دەکەون ).**

***گلۆستەر***: ئێ قوربان، بڵێ بزانم خەڵکی شار چییان گوت؟

***بکینگهام***: قەسەم بە دایکی موقەدەسی خوا، هەموو کڕو کپ، ورتە لە کەسیانەوە نەهات.

***گلۆستەر***: باشە ئیماژەت بۆ ئەوە کرد کە گومان لە حەلاڵزادەیی منداڵەکانی ئیدوارد هەیە؟

***بکینگهام***: بەڵێ، ئاماژەم بۆ ئەوەش کرد کە چۆن پێشتر خاتوو لوسی مارە کردووە، ئاماژەم بۆ ئەوەش کرد کە خۆی لە فەرەنسا بووەو بە وەکالەت ژنی مارە کردووە، ئاماژەم بۆ هەوەسبازی و داوێن تەڕیی بێ پایانی و چۆن تەعەدای ناموسی لە ژنانی شار دەکرد، کرد، چۆن لەسەر شتی زۆر بچووك زوڵمی لە خەڵکی کردووە، هەروەها ئاماژەم بۆ ئەوەش کرد کە گومان لە حەلاڵزادەیی خۆیشی هەیە، چونکە وەختێ ئەو لە دایك بووە، بابت لە فەرەنسا بووە، ئەمە جگە لەوەی کە سیمای لە سیمای بابی نەجیبت ناچێ، ئەوجا باسی ئەوەم کرد کە شێوەی تۆ کوت ومت لە شێوەی بابت دەچێت، هەم لە رواڵەتا و هەم لە شکۆمەندی بیرا، بە ئاشکرا باسی سەرکەوتنەکانی ئوسکوتلاندام کردیت، گوتم چۆن لە شەڕا قارەمان و ئەزموودار، لە ئاشتیا بە حیکمەت و دانای، چەند کەسێکی دلاواو فەزڵدار و بێ فیزو دەعیەی. ئەلهەقی هەر شتێك لە قازانجی مەبەست و ئارمانجەکانی تۆدا بوو، هیچم نەبوارد، هەموویم باسکرد، کە لە قسان بوومەوە، داوام لێکردن کێ نیشتمانی خۆی خۆشدەوێ با هورا بکێشێت و بڵێ: ***"پەروەردگار، ریچارد، پاشای مەزنی ئینگلتەرا بپارێزێ"***.

***گلۆستەر***: باشە هورایان کێشا؟

***بکینگهام***: ناوەڵڵا! تاقە وشەیەکیان لە زار نەهاتە دەرێ! بەڵکو کڕوکپ، ئەبلەق و رەنگ بزرکاو دەیانڕوانییە یەکدی، لە تۆ وایە پەیکەری لاڵ و تاوێری روح لەبەری بێ زمانن. کە ئەمەم لێدیتن زۆرم لۆمەکردن، هۆی ئەو بێدەنگییە سەختەم لە شاردار پرسی، وەلامی دامەوە بۆیە بێدەنگن چونکە فێری ئەوە نین جگە لە بەڕێوەبەری کۆڕ (سەرۆکی دادگا) چ کەسێکی دی باسی ئەو شتانەیان بۆ بکات. ئیدی داوام لێکرد قسەکانی منیان بۆ دووبارە بکاتەوە، ئەلهەقی بێ ئەوەی تاقە وشەیەکی خۆی بخاتە سەر قسەکان، بێ کەم و زیاد قسەکانی منی وەکو قەوان بۆ لێدانەوە: ***"جەنابی دۆك وای فەرموو، ووای گوت"***، هەر کەر لە قسەکانی بووەوە، چەند کەسێك لە دەستو پێوەندەکانی من کە لە بنی هۆڵەکەوە دانیشتبوون، هاڕوژان و شەپقەکانیان بە حەوادا هەڵداو نزیکەی دە کەسێك کەوتنە هوراکێشان: "خوا ریچارد شا بپارێزێ!" منیش هورا کیشانەکەی ئەم چەند نەفەرە کەمەم بە فرەسەت زانی و گوتم: ***"گەلی وڵاتپارێزو دۆستانی هێژا سوپاستان دەکەم، هەڵبەتە ئەم رەزامەندییە گشتییەی ئێوەو ئەو هورا مژدە بەخشەی هەمووتان خۆی لە***

***خۆیدا نیشانەی ژیریتانە، بەڵگەی خۆشەویستیتانە بۆ ریچارد"*** . هەنگێ کوڕەکەم بەجێهێشت و بۆ ئێرە هاتم.

***گلۆستەر***: وا دیارە بەردی لاڵ بوون! یانی نەیاندەویست قسان بکەن؟!

***بکینگهام***: نە، بە شەرافەتم ئەزبەنی.

***گلۆستەر***:کەواتە شاردارو دارو دەستەکەی نایەن؟

***بکینگهام***: هەر ئێستا دەگاتە ئێرە، جا ئەزبەنی، جەنابی لۆرد تۆ هەنوکە وا بنوێنە کە دەترسیت و بە هیچ جۆرێ تاقەت و ئارەزووی قسە کردنت نیە، مەگەر بە تکایەکی زۆر بێیتە قسان، کتێبێکی نوێژو دوعایان بە دەستەوە بگرەو لە بەینی دوو پیاوی ئاینی دا رابوەستە، ئەوسا بڕوانە چ سیناریۆیەکی موقەدەسی لێ دروست دەکەم... تۆ بە ئاسانی وەڵامی ئێمە مەدەوە. رۆڵی ئەو کیژە عازەبانە بگێڕە کە خوازبێنیکەریان دەچێت، هەمیشە هەر دەڵێن: (نا!) بەڵام لە ئەنجامدا قاییل دەبن و دێنە رەدا، چونکە بەمە کارەکەت رایی دەبێ و سەر دەگرێت.

***گلۆستەر***: وا من دەڕۆم، تۆ تا دەتوانی لە جیاتی ئەوان داوای دیتنم بکە، منیش تا دەتوانم رەفزی دەکەم، ئەگەر بە چاکی ئەو دەورانە بگێڕین، بێگومان تەگبیرەکەمان سەر دەگرێ و سەر دەکەوین.

***بکینگهام***: خێراکە بڕۆ، بچۆرە سەربان، چونکە ئەوە شارداره لە دەرکە دەدا، ***(گلۆستەر وەدەردەکەوێ).***

***(شاردار و هەندێ هاووەڵاتی وەژوور دەکەون)***

قوربان بە خێر هاتی، من لێرە لە خزمەتودام.. لەو ساوە چاوەنۆڕم، پێدەچێ جەنابی دۆك حەز نەکات لەو بارەیەوە قسە لەگەڵ کەس دا بکات، ئێستا خزمەتکارەکەی دۆك دێ. ***(کاتسبی وەژوور دەکەیێ).***

***کاتسبی***: گەورەم، جەنابی لۆردی نەجیب، دۆك عەرزی کردی سبەی یان دوو سبەی سەری بدەی، کونجی ژوورەوەی گرتووە، دوو قەشەیەی بەڕێزی لەگەڵدایە و خەریکی نوێژو دوعا و تەئەمولن، هیچ داوایەکی دنیایی ناتوانێ لەو کارە پیرۆزە ، لەو نوێژو دوعا بە کولێ و دڵەی بکات.

***بکینگهام***: کاتسبی گیان، پیاوی چابە ئەمجارەش بچۆرەوە بۆ لای دۆکی پایە بەرز و پێی بڵێ ئێمە، من و شاردار، و هەندێ لە یارانی، هاتووینە بۆ خزمەتی تا دەربارەی هەندێ کاروباری گرینگ، کە پەیوەندی بە بەرژەوەندی هەموومانەوە هەیە، قسەی لەگەڵ بکەین.

***کاتسبی***: گەورەم، هەر ئێستا هەموو قسەکانی جەنابتی پێ رادەگەیەنم، ***(وەدەردەکەوێ).***

***بکینگهام***: خۆ گوێت لێ بوو جەنابی لۆرد، ئەم پیاوە، وەکو ئیدوارد نییە، رۆژان لە نێو نوێنی فەسادو رابواردنا ناگوزەرێنێ، بەڵکو بە کڕنۆش و وێردو دوعایان دەیباتە سەر، کاتی خۆی دەگەڵ سۆزانی و روسپیاندا بەفیڕۆ نادات، بەڵکو لەگەڵ جووتێ قەشەی خواناسدا خەریکی دوعاو نوێژە، نەچووەتە خەو تا قەڵەو بێ و گۆشت و بەز بناتە سەر یەك، بەڵکو نوێژو دوعا دەکات تا روحی بێدار و زندووی پاك بکاتەوە، ناخی پڕ بێ لە خوا پەرستی و تەقوا، ئەگەر ئەم

میره خواناسه بێته ڕەدا و پاشایەتی ئینگڵتەرا قەبوڵ بکات، ئینگڵتەرا بەختەوەر دەبێت، خێرو خۆشی بەسەردا دەبارێت! بەڵام من دەترسم پێمان قاییل نەکرێت.

***شاردار***: خوا ئەوەمان لەگەڵ نەکا کە ڕەفزی بکات!

***بکینگهام***: دەترسم ڕەفزی بکات. ئەوە کاتسبییە، وا هاتەوە. ***(کاتسبی دەگەڕێتەوە)*** ها کاتسبیٚ ئێستا سەروەرتان چ دەڵیٚ؟

***کاتسبی***: قوربان، پێی سەیرە بۆ ئەم هەموو خەڵکەی شارتان خڕ کردووەتەوە تا قسەی لەگەڵ بکەن، بەبیٚ ئەوەی پێشوەختە ئاگادارتان کردبێتەوە؟! ئەوی ڕاستی بیٚ جەنابی لورد، لە نیازو مەبەستی تۆ دڵنیا نییە.

***بکینگهام***: بە داخەوەم کە پسمامی نەجیبم لە نیازو مەبەستی من بەگومانە، قەسەم بە زاتی خوا گەر زۆرم خۆش نەویستبا دوو پێم نەدەهات. بچۆرەوە بۆ لای و ئەمەی پیٚ بڵیٚ. (کاتسبی هەمدیس دەچێتەوە بۆ لای) ئیدی ئەمە دابی خواناسانە، هەر کە دەستیان دایە تەزبێح و کەوتنە حاڵی نوێژ و دوعایان، زۆر زەحمەتە لەو حاڵەیان بێنیتە دەر. چەند جوانە کاتیٚ مرۆڤ غەرقی تەئەمولات و دوعاو نزای گەرم و گوڕ دەبیٚ!

***(گلۆستەر، لە بەینی دوو قەشەدا، قیت و قوت وەژوور دەکەویٚ، و کاتسبی دەگەڕێتەوە.)***

***شاردار***: بڕوانە چۆن لە ناوەڕاستی دوو قەشاندا دەڕوا.

***بکینگهام***: ئەمانە دوو نیگابانی ڕوحانین، دوو کۆڵەکەی چاکەن، ئەملاو ئەولای شازادەیەکی مەسیحیان گرتووە، تا بیپارێزن و نەیەڵن بکەوێتە هەڵدێری غرورو خۆپەرستییەوە، تۆ بڕوانە، کتێبێکی دوعاو نوێژیشی بە دەستەوەیە! ئەم شتانە زینەت و نیشانەی پیاوی خواناسن، ئەی میری بلیمەت، ئەی وەجاخی ڕۆشنی خانەدانی ماڵباتی پلانتاجنت! تکایە گویٚ لە ئێمەش بگرەو وەڵامێکی بەخێرمان بدەوە، ببوورە کە لە خەڵوەت و عیبادەتی ڕاستەقینەی مەسیحیەتمان هێنایتە دەریٚ.

***گلۆستەر***: قوربان، جەنابی لۆرد پێویست بە عوزرخوایی ناکات، من داوای بوردن لە ئێوە دەکەم، چونکە من لە خزمەتی خودای خۆمدا بووم، زوو بە دەنگ داوای دۆستەکانمەوە نەهاتم، جا ئێستا بفەرموون، چیتان دەویٚ؟

***بکینگهام***: ئەوەمان دەویٚ کە هەم خوای بانی سەرو هەم هەموو خەڵکی باشی ئەم دوڕگە بیٚ فەرمانڕەوایە، پێیان خۆشە.

***گلۆستەر***: ترسام تاوان و خەتایەکم کردبیٚ و خەڵکی شار لێم ڕەنجابن و ئێوەش هاتبن بە ناوی ئەوانەوە گلەیی و گازەندەم لیٚ بکەن.

***بکینگهام***: بەڵیٚ ئەزبەنی، جەنابی لۆرد، گوناهێکت کردووە، جا بۆ وەی لەو گوناحە پاک بیتەوە، تکامان وایە سەروەرتان بە گوێمان بکەن و قسەمان نەشکێنن.

***گلۆستەر***: لە مەسیحیەت مەحروم بم گەر بە قسەتان نەکەم.

***بکینگهام***: دەیسا چاک بزانە تاوان و گوناحەکەت ئەوەیە کە، واز لە پایەی بەرز، و عەرشی شکۆدار، و سەوڵەجانی باب و باپیرانت دێنی، و دەستبەرداری ئەو پێگەیە دەبی کە بەخت و نێو

چەوانی خۆت، شۆڕەتی ئابادو ئەژدادت، شکۆی حەلاڵ و زولاڵی خانەدانی شاهانەت پێی بەخشیویت ،وازت لە هەر هەموو ئەمە هێناوەو بە بنەماڵەیەکی نەنگین نەژادت سپاردووە تا بە کەیفی خۆی هەمووی بلەوتێنێ و تۆش لە خەم و خەیاڵی ئەندێشەو بیرە چاکەکانی خۆتا غەرق بی، جا ئێمە هاتووین، لەبەر خاتری ئەم وڵاتەو، لە پێناوی بەرژەوەندی ئەم وڵاتەدا، لەو خەوی خەیاڵەت بێدار بکەینەوە، چونکە ئەم دورگە شکۆدارە، دوای ئەوەی زامی شەرمەزاری رووی شێواند، و شەجەرەی ماڵباتە شاهانەکەی تێکەڵ بە شەجەرەی پیس و خراپ بوو، و چیوای نەماوە بکەوێتە هەڵدێری سامناکی فەرامۆشی و بیر چوونەوەیەکی نابیناوە، پێویستی بە هێزی بازووی رۆڵە دڵسۆزەکانیەتی، بۆیە ئێستا لە کانگای دڵەوە داوات لێدەکەین، هیمەت بفەرموو، فریا بکەوەو، شان بدە بەر ئەم بارە قورسە، و حوکمی ئەم وڵاتە بگرە دەست، نەك وەکو وەسی، یان سەرپەرشتیار، یان جێنشین، نەك وەکو سەر وەسێتێکی گومناو خزمەتی کەسێکی دی بکەی، بەڵکو وەکو پاشایەك بە کۆمەڵێك هەقەوە حوکمی وڵاتی خۆی بکات، بەو هەقەی پاشایەتی لە بابەلبابەوە بە میرات بۆ ماوەتەوە، بەو هەقەی پاشازادەیە، بەو هەقەی وڵات وڵاتی خۆیەتی، و بەو هەقەی لەسەر خۆی هەیەتی، جا بەو مەبەستە، من لەگەڵ خەڵکی شارا —لەگەڵ دۆستانی زۆر میهرەبان و دڵسۆزی تۆدا هاتووم و بە هاندان و پێ داگرتنی لە رادەبەدەری ئەوان، بەم داوا قانونیەوە هاتووم تا سەروەری پڕ لوتفی خۆم بۆ ئەم کارە هان بدەم.

***گلۆستەر***: نازانم، تیا ماوم، هەر قسە نەکەم و بە بێدەنگی بڕۆم یان بێمە قسەو سەرزەنشتی تۆ بکەم؟ چ بڵێم، ئەوە بڵێم کە لەگەڵ هەستی خۆمدا دەگونجێ یان لەگەڵ هەستی تۆدا دەسازێ؟ ئەگەر وەڵامت نادەمەوە رەنگە بڵێی تەماح زمانی بەستووم، و بێدەنگیم نیشانەی رەزامەندییە، نیشانەی قایبل بوونمە بەوەی نیری زێڕینی شاهانە لە مل بکەم، ئەو نیرەی کە تۆ زۆرت حەز لێیە لە ئەستۆمی بکەی، ئەگەر لەسەر ئەم داوایەت، کە نیشانەی دڵسۆزی و وەفاداریتە بۆ من، گلەییت لێبکەم، ئەوا لەوەیە دۆستەکانم لە خۆم بڕەنجێنم. جا بۆ ئەوەی خۆم لە هەردوو حاڵەتەکە ببوێرم، رێك و رەوان وەڵامت دەدەمەوە و دەڵێم: دڵسۆزی و وەفاداریت بۆ من جێگەی رێزو سوپاسە، بەڵام من لەوە بچووکترم باری داخوازییە گەورەکەی تۆ بەرم، ئەگەر هەموو کۆسپەکانیش تەخت بکرێ و رێگەی من بەرەو تاج هەموار بکرێ، ئەو تاجەی کە وەکو هەقێك بە حوکمی تەمەن و ئەزموونی ژیان، بە حوکمی شازادەییم، بەر من دەکەوێ، وا چاکە منی سست هیمەت و پڕ کەم و کوڕی ،خۆم لەو رێگەیە لادەم کە دەچێ بۆ شکۆداری، چونکە ئەمەم گەلێك باشترە لەوەی هەڵپەی بۆ بکەم و پاشان لە تەپوتۆزی شکۆداریدا ون ببم و بخنکێم. من بەلەمێکی چکۆلەم و بەرگەی دەریای بە پیل و شەپۆلان ناگرم، سوپاس بۆ ئەو خوایە کە هیچ پێویستییەکتان بە من نییە، خۆ ئەگەر هەشتان بێ من لەوە بێ تواناترم فریاتان بکەوم، درەختی شاهانە میوەیەکی باش و رەسەنی بۆ خستوینەتەوەو لەگەڵ تێپەڕ بوونی خێرای رۆژگاردا پێدەگات، و دەتوانێ عەرشی شکۆداری بگرێتە دەست و بێگومان بە فەرمانڕەوایی خۆی شادمان دەکات. بۆیە شان نادەمە بەر ئەو ئەرکەی کە ویستتان بە ملی منیا بدەن، چونکە ئەمە ئەرکی

ئەوە، هەقی خۆیەتی، هەقی بەخت و ناوچەوانی شادمانی خۆیەتی، خودا ئەوە نەکات لێی زەوت بکەم.

***بکینگهام***:جەنابی لۆرد، ئەوە بەڵگەی بە ویژدانی جەنابتە بەلام ئەو هۆیانەی باست کردن، ئەگەر لە هەموو ڕوویەکەوە لێك بدرێنەوە، هۆی ناچیزن و قەناعەت بەخش نین، تۆ دەڵێی ئیدوارد* برازاتە، ئێمەش لاریمان لەمە نییە، بەلام خۆ لە ژنەکەی ئیدوارد** نیە، چونکە برایەکەت هەوەڵجار خاتوو لوسی خواست، دایکت شایەدەو هێشتا ماوە. دوای ئەوە بە وەکالەت (بونا)ی خوشکی پاشای فەرەنسای مارە کرد، ئەوسا وازی لە هەردووکیان هێناو بایدایەوە سەر بێوەژنێکی کلۆڵی، دایکی چەندین منداڵ، بێوەژنێکی نا ئومێد، کە ئەستێرەی جوانی کەوتبووە لێژی و بەرەو ئاوا بوون دەچوو، ئەو بێوەژنە کە لە خەزانی تەمەنیا بوو، توانی چاوە نەوسنە شەهوەتبازەکانی کەمەندکێش بکات، و لە لوتکەی بەرزییەوە بیخاتە زەلکاوی هاوسەرگیرییەکی نەنگینی حەیابەرەی ناشەرعیەوە*، جا ئیدوارد زادەی ئەم زەوجینە نا شەرعیەیە، کە ئێمە ئەخلاقمان ڕێمان نادات پێی نەڵێین میر. گەر لەبەر خاتری هەندێ کەس نەبووایە کە هێشتا لە ژیاندان**، ئەوا زمانی خۆم لێ بەرەڵلا دەکرد و لە بنی کولەکەم دەدا.

بۆیە تکات لێدەکەم ئەزبەنی، ئەم پۆستە شاهانەیە قەبوڵ بکە، ئەگەر لەبەر خاتری ئێمەو لەبەر بەرژەوەندی ئەم وڵاتەش نەبێ، لەبەر خاتی خۆت قەبوڵی بکە تا ڕەگ و ڕەچەڵکی نەجیبی خۆت لە هەڵدێر و نشێوی گەندەڵیی ئەم ڕۆژگارە بەدە دەربێنی و بیخەیتەوە سەر ڕێچکەو ڕێبازە ڕاست و دروستکەی خۆی.

***شاردار***: جەنابی لۆرد، ئەی نەجیبی نەجیمزادە، کوڕانی وڵاتەکەت تکاتان لێدەکەن، قبوڵی بکە.

***بکینگهام***: ئەی سەروەری مەزن، وەفاداری و خۆشەویستی ئێمە ڕەفز مەکە،

***کاتسبی***: قسەیان مەشکێنە، دڵیان خۆش بکە، داوا قانونیەکەیان قەبوڵ بکە.

***گلۆستەر***: ئەفسوس، بۆچی دەتانەوێ ئەم هەموو دەردو خەمە لەمن بار بکەن؟ ئاخر من نە بە کەڵکی حوکمداری دێم، نە بە کەڵکی پاشایەتی. ئومێدەوارم لێم نەڕەجێن، چونکە من نە دەتوانم ئەو داوایەتان قەبوڵ بکەم و نە قەبوڵیشی دەکەم.

***بکینگهام***: ڕەنگە لەبەر ئەوە قبوڵی نەکەی، چونکە ئێمە دەزانین تۆ لە ناخی دڵەوە، ڕاستگۆیانە برازا بچووکەکەت خۆش دەوێ، و دڵت نایە عەرشەکەی لێ زەوت بکەی، دەزانین چەند میهرەبان و پڕ بەزەییت دەرهەق بە خزمانت، بەڵکو دەرهەق بە هەموو خەڵکی، بەلام تۆ داواکەمان قەبوڵ بکەی یان ڕەفزی بکەی، ئێمە برازاکەت بە پاشای خۆمان قبوڵ ناکەین، کەسێکی دی دێنینە سەر

---

* ئیدوارد : شازادەی چکۆلە، جێ نشین

** ئیدوارد : شا ئیدواردی چوارەم ( بابی شازادە ئیدواردی بچووك )

* خواستنی بێوەژن بە نا شەرعی حەساو کراوە

** مەبەستی دایکی شا ئیدواردە کە دایکی دوك گلۆستەریشە.

تەخت، ئەو کەسەش بنەماڵەکەتان لە ناو دەبات، لەکەداری دەکات، ئێمە بەم نیازو بڕیارەوە تۆ بەجێ دێڵین. کوڕینە با بڕۆین، قەسەم بە زامەکانی مەسیح چیتری لێ ناپاڕێمەوە.

***گلۆستەر***: جەنابی لۆرد بکینگهام سوێند مەخۆ.

***(بکینگهام و هاوشارییەکان و وەدەردەکەون).***

***کاتسبی***: گەورەم گازیان بکەوەو داواکەیان قەبوڵ بکە. ئەزبەنی قسەیان مەشکێنە با هەموو خەڵکی وڵات زویر نەبن.

***گلۆستەر***: یانی هەر سوورن لەسەر ئەوەی ئەم ژیانە پڕ خەمەم بەسەرا بسەپێنن؟ کەواتە بڕۆ بانگیان بکە ***(کاتسبی وەدەر دەکەوێ)*** خۆ من دارو بەرد نیم، تکاکەتان کاری لە دڵم کرد، هەر چەندە روح و ویژدانم بەم کارە ناڕەحەتە. ***(بکینگهام و ئەوانەی لەگەڵی بوون دەگەڕێنەوە).*** ئامۆزا بکینگهام، ئێوە ئەی خاوەن راو تەگبیران، مادامێکی سوورن لەسەر ئەوەی، خۆشم بێ و ترشم بێ، ئەو تەوقی شکۆدارییەم لەمل بکەن، چارم ناچارە کە رازی بم بە رەزای ئێوە، ئومێدەوارم، ئەگەر تووشی هەر ریسواییەك بووم یان هەر لۆمەو گازاندەیەکی خەڵکیم هاتە سەر گوایە من پیاوێکی پیلان گێڕم، ئەم ناچارییەی ئێوە بەسەرتانا سەپاندووم پاکانەم بۆ بکات، چونکە خوا دەیزانێ و ئێوەش بە چاوی خۆتان دەبینن کە حەز بەو پلەو پایەیە ناکەم.

***شاردار***: ئەی باریکەڵڵا لە خۆت و لە عەزەمەتت! ئێمەش ئەوەی دیتمان، ئەوە دەگێڕینەو.

***گلۆستەر***: هەڵبەتە ئەم قسەیەت خودی حەقیقەتە و خیلافی تیا نیە.

***بکینگهام***: کەواتە من پیرۆزبایی ئەم پاشایەتییەت لێ دەکەم و هاوار دەکەم: ***"بژی ریچارد، بژی پاشای گەورەی ئینگلتەرا!"*** .

***شاردار و خەڵکەکە:*** با بژی، با!

***بکینگهام***: دەتەوێ سبەینێ ئاهەنگی تاجگوزاریت بۆ بگێڕین؟

***گلۆستەر***: کەیفی ئێوەیە، چۆنتان پێ خۆشە و کەیتان لا باشە، باوابێ.

***بکینگهام***: کەواتە سبەینێ بە خزمەتی جەنابت دەگەینەوە، بەڵام ئێستا بەوپەڕی شادییەوە لە خزمەت مەرەخەس دەبین.

***گلۆستەر***: دەی با ئێمەش بگەڕێینەوە سەر کارو دوعاو نوێژە پیرۆزەکەی خۆمان، خودا حافیز ئامۆزا گیان، خواتان لەگەڵ دۆستانی نەجیب.

***(دەڕۆن).***

# فەسڵی چوارەم

## دیمەنی یەکەم

## بەردەمی بورج

( شابانۆ ئەلیزابت و دۆکبانۆ یورك و مەرکیز دورست لەلایەکەوە وە ژووردەکەن، لەلایەکی ترەوە ئان، ژنی گلۆستەر کە مارگرێت پلانتاجنت-ی کیژە چکۆڵەکەی کلارنس-ی لەگەڵە وەژوور دەکەون ).

***دۆکبانۆ***: خوایە کێ دەبینم؟ پلانتاجنت-ی نەوەم، دەست لەنێو دەستی ژنی مامە میهرەبانەکەی (گلۆستەر)؟، بە سەری من دەچی بۆ بورج، سۆزو میهری دڵە پاکەکەی هەڵیگرتووە تا سەردانی هەردوو میری میهرەبان بکات،بە خێرایی کیژەکەم.

***ئان***: هەردووك بانۆی پڕ لوتف، ڕۆژتان باش و خودا خێرو خۆشیتان پێ عەتا بکات.

***شابانۆ ئەلیزابت***: بەیانی خۆتیش باش خوشکی ئازیز! بۆ کوێ؟

***ئان***: بۆ بورج دەچین، ئێمە بۆ هەمان کاری خێری ئێوە دەچین، دەچینە دیدەنی و سەردانی هەردووك میر.

***شابانۆ*** ئەلیزابت: سوپاس خوشکی ئازیزم، هەموو پێکەوە دەچینە ناو بورج *(بروکنبری لە بورجەوە دێ)* باش بوو بەڕێوەبەری بورج *(سەرۆکی نیگابانان)*. لە کاتی پێویستدا هات، جەنابی بەڕێوەبەری بورج، بە یارمەتیت ئەرێ میرو کوڕە چکۆڵەکەم، یورك چۆنن؟

***بروکنبری***: زۆر باشن بانۆی بەڕێز، بەڵام ببورە ناتوانم ڕێت بدەم بیان بینی، چونکە ئەمە ئەمری بێ چەندو چوونی پاشایەو ناتوانم لە عەردی بدەم.

***شابانۆ ئەلیزابت***: پاشا! پاشا دەکاتە کێ؟

***بروکنبری***: ببوورە، مەبەستم جەنابی نایب (وەسی) بوو.

***شابانۆ ئەلیزابت***: خودا ئەو لەقەبە شاهانەیەی پێ ڕەوا نەبینی! یانی وای لێهات سنوور لە نێوان ڤیانی من و ئەوان دابنێ؟ من دایکیانم دایك ، کێ دەتوانێ من لەوان دابڕێ؟

***دۆکبانۆ***: من داپیرەیانم، دایکی بابیانم، هەر دەبێ بیاندینم.

***ئان***: منیش بە قانون ئامۆژنیانم و بە دڵ دایکیانم، تۆ ببمە بۆ لایان، هەر مەسئولیەتێکت هاتە سەر لەسەر من.

***بروکنبری***: نە، خانم، نە ، ببورە ناتوانم، چونکە من سوێندی وەفاداریم خواردووە، (وەدەردەکەوێ)، (لۆرد ستانلی وەژوور دەکەوێ).

***ستانلی***: بانۆیان، خانمان ئەگەر پاش سەعاتێکی دی بینیمنەوە ئەوە پیرۆزبایی ئەوە لە دۆکبانۆ یورك دەکەم کە تەمەن مەودای دا تا هەردوو بووکەکەی وەکو دوو شابانۆ، لە دوو پایەی

شابانۆی جواندا بدێنیٚ. (بە ئان) تۆش خانم یەکسەر بڕۆ بۆ ویستمنیستەر تا لەویٚ لەگەڵ ریچاردی مێردتا، تاجی شابانۆیی لەسەر بنەی.

***شابانۆ ئەلیزابت***: وەرەن لە خەم دادڕن ، تا دڵی زیندانیم هەناسە بدات، خەریکە لە داخی ئەم هەواڵە کوشندەیە دەبورێمەوە.

***ئان***: کە هەواڵێکی رکونیە! کە هەواڵێکی ناخۆشە!

***دورست:*** ورەتان بەرز بیٚ، ئێستا چۆنی دایکە؟

***شابانۆ ئەلیزابت***: ئاه دورست، قسان لەگەڵ من مەکە، خەمی منت نەبیٚ، فریای خۆت بکەوە، لێرە بڕۆ، مەرگ و وێرانی بە دواتەوەن، نێوی دایکت بۆ منالەکانی شوومە، مایەی نەگبەتیە. ئەگەر دەتوانی لە مەرگ بخەلەسی. خێرا لە دەریا بپەڕەوە، بچۆ لەگەڵ ریچموندا، دوور لە دۆزەخ بژی. دەی لەزێکە! خێراکە خۆت لەم قەسابخانەیە دەرباز بکە، با ژمارەی مردووان بە تۆوە زیاد نەکات، با ئاهو نزولەی مارگرێت، تووک و نەفرینی مارگرێت نەمگرێت و نە بە ناوی دایك، نە بە ناوی ژن، نە بە ناوی شابانۆیەکی ناسراو و ناوداری ئینگڵتەرا بمرم.

***ستانلی***: ئەمە ئامۆژگارییەکی ئاقڵانەیە خانمەکەم.

(بە دورست) خێراکە، کاتی خۆت بە فێرۆ مەدە، جواب بۆ ریچموندی کوڕم دەنێرم، تا بە پیرەتەوە بیٚ و پێشوازیت بکات، ماتەڵ مەبە دەنا ئاخری خێر نابیٚ،

***دۆکبانۆ***: ئەی بای شوومی نەگبەتی و بەدبەختی! ئەی مندالدانی نەحسی من، ئەی بێشکەی نەگبەتی، تۆ ئەژدیهایەکت هێنایە سەر دنیا، چاوانی کوشندەی بەر هەر کەسێك بکەون، دەیکوژن.

***ستانلی***: خێراکە خانم، چونکە ئەمرم پێکراوە بەپەلە بتگێڕمەوە.

***ئان***: من بەوپەڕی ناچاری دەڕۆم، لەو خوایەم گەرەکە کە قەراخی ئەو تاجەزێڕەی کە دەبیٚ لەسەرم بکریٚ، ببیٚ بە ئاسن و پۆڵایەکی سوورەوە بوو و مێشکم بسووتێنیٚ و ببیٚ بە خۆڵەمێش. بریا ژەهرێکی کوشندەم تیٚ هەڵدەسوون و دەمرم، بەر لەوەی خەڵکی فریا بکەون بڵێن: "بژی شابانۆ!".

***شابانۆئەلیزابت***: برۆ، برۆ ئەی کلۆڵی داماو، بە غیلی بە شکۆداریت نابەم. بۆیە پێویست ناکات لەبەر دڵی من دوعایان لەخۆ بکەی.

***ئان***: بۆ نە ء؟ کاتیٚ کە من بە دوای جەنازەکەی هنری دا دەڕۆیشتم، ئەو پیاوەی کە ئێستا مێردمە هات بۆ لام، و هێشتا دەستی بە خوێنی مێردە پاك و بێگەردەکەم، بە خوێنی ئەو قەدیسە سوور بوو، کە بەدەم گریانەوە دوای جەنازەکەی کەوتبووم.بەڵیٚ لەو کاتەدا کە چاوم بە چارەی ریچارد کەوت، کەوتمە تووك و نەفرەتان، و پێمگوت: "بەر نەفرەت بکەوی، خێرنەبینی وەکو لە هەڕەتی لاویدا کۆستی منت خست و کردمت بە بێوەژن، ئومێدەوارم ئەگەر ژنت هێنا، لەبەری نەحەسێیتەوە، خەم لە نووستنگەکەت دوور نەکەوێتەوە، خێر نەیەتە رێی ژنەکەشت، کۆستی بکەویٚ، ئەگەر ژنێك هەبیٚ بە تۆ رازی بیٚ، وەکو چۆن تۆ بە کوشتنی مێردە ئازیزەکەم کۆستی منت خست".

بەلام هەر زوو دڵی ساویلکەی ژنانەی من، کەوتە داوی زمانە لوسەکەیەوە، و چیتر نەفرەتم لێنەکرد، تووك و نەفرینەکەم رووی خۆمی گرتەوە، لە خۆم گیرا... ئەو نەفرەتە لەو رۆژەوە تا ئێستا ئارامی لە چاوانم بڕیوە، بۆ تاقە سەعاتێ لە جێگاکەیدا، لە پاڵیا، ئاونگی خەوی زێڕین نەنیشتووەتە سەر چاوانم، بەڵکو هەمیشە بەدەم خەونە سامناکەکانی ئەوەوە راچڵەکیوم. سەرباری ئەمەش رقی لە یورکی بابمەو لەبەر ئەمە دەمبوغزێنێ، بێگومان بەو زووانە لە کۆڵی خۆیم دەکاتەوە.

***شابانۆ ئەلیزابت***: بە دوعا ئەی کڵۆڵ! بەزەییم بە حاڵتا دێتەوە.

***ئان***: منیش لە تۆ زیاتر خەمباری خەمەکانی تۆم.

***شابانۆ ئەلیزابت***: بە *دوعا* ئەی پێشوازیکەری خەمگینی شکۆداری!

***ئان***: بە دوعا ئەی کڵۆڵ، ئەی بەدرەقەچی شکۆداری!

***دۆکبانۆ***: (بە دورست): تۆ بڕۆ بۆ لای ریچموند، بەخت یارو یاوەرت بێ! (بە ئان): تۆ بڕۆ بۆ لای ریچارد فریشتەی ئاسمان ئاگادارت بێ ! (بە شابانۆ ئیلزابت) تۆ بڕۆ بۆ حەرەمی کڵێسا، خوا سێبوری دڵت بدا!.

منیش بەرەو گۆڕی خۆم دەچم، ئومێدەوارم ئاشتی و ئاسایش یاوەرم بن! هەشتا* دانە ساڵی پڕ خەم و داخ و کەسەرانم بەڕێ کردووە، ئەگەر سەعاتێك خۆشیم دیبێ، لەبری ئەو سەعاتە، یەك هەفتە داخ و کەسەرم چەشتووە.

***شابانۆ ئەلیزابت***: تۆزێ بوەستە، و لەگەڵما نیگایەکی بورج بکە. ئەی کۆنە بەردو سەنگان، رەحمێ بەو دوو تولفە ناسکەدا بکەن، ئەو جووتە تولفەی حەسوودی و بەغیلی، و کەرب کینە هەڵیداونەتە ئەودیوی دیوارەکانتانەوە! ئەی بێشکەی زبرو نارەحەت بۆ ئەو جووتە منداڵە جوانە، ئەی دایەنی دڵرەقی شڕپۆش، ئەی هاوڕێی پیرو عەبوسی ئەو جووتە شازادە شکلە، بەزەییەکت بە کوڕەکانم دا بێتەوە، رەفتارت لەگەڵیاندا نەرم و نیان بێ، ئەی کۆنە بەردان، خەمی بێفایدەی من بەو جۆرە دوعا خوازیتان لێدەکات.

***(بە دوو قۆڵی وەدەردەکەون)***

---

* دۆکبا نۆ یورك: شەست و هەشت ساڵ ژیاوە، وا دیارە داخ و کەسەری زەمانە تەمەنی راستەقینەی خۆی بیر بردۆتەوە.

## دیمەنی دووەم

## لەندەن – کۆشك

**(دەنگی شەیپور، ریچارد بە شان و شەوکەتی شاهانە و تاج لەسەر وەژوور دەکەوێ، کاتسبی و خولامێك و چەند کەسێکی دی لەگەڵە).**

***ریچارد شا*:** لە دوورەوە بوەستن – ئامۆزا بکینگهام!

***بکینگهام*:** بەڵێ، پاشای پڕ لوتفی من!

***ریچارد شا*:** کوا دەستم بدەیە ***(سەر دەکەوێتە سەر تەختی پاشایەتی)*** بەراوێژ و کۆمەکی تۆ ریچارد شا لەسەر ئەم عەرشە بەرزە دادەنیشێت. بەڵام ئایا ئەم شکۆدارییە تەنیا یەك رۆژ بڕ دەکات؟ یان بەردەوام دەبێ و پێی شاد دەبین؟

***بکینگهام*:** هەر پایەدارو بەردەوام بێ ئەم شکۆدارییە!

***ریچارد شا*:** ئێی بکینگهام، هەنووکە مەعدەنەکە لە مەحەك دەدەم تا بزانم ئاخۆ زێڕی خالیسەیە یان نا، ئیدواردی جەوان هێشتا لە ژیاندایە، دەتوانی پەی بە مەبەستم بەری؟

***بکینگهام*:** ا بیڵێ سەروەری پڕ میهرم.

***ریچاردشا*:** دەڵێم، بەڕاستی دەمەوێ ببمە پاشا.

***بکینگهام*:** جا سەروەری ناودارم، بەڕاستی پاشایت!

***ریچارد شا*:** ها! یانی من بەڕاستی پاشام؟ راستە، بەڵام ئیدوارد هێشتا زندووە.

***بکینگهام*:** بەڵێ، وەکو شازادەیەکی نەجیب و دڵسۆز، زندووە.

***ریچاردشا*:** ئەمە زۆر خراپە، کە ئیدوارد وەکو "شازادەیەکی نەجیب و دڵسۆز" زندووبێ، ئامۆزا من قەت تۆم بەم نەفامییە نەدیووە.یانی بە راشکاوی قسان بکەین؟ من دەخوازم ئەم جووتە حەرامزادەیە نەمێنن، حەز دەکەم بە زووترین کات لە نێو ببرێن، تۆ چ دەڵێی؟ خێرا و بە کورتی رای خۆتم پێ بڵێ!

***بکینگهام*:** جەنابت، دەتوانی هەر چیت پێخۆشە بیکەی؟

***ریچارد شا*:** وس وس، هێندە ساردی دەڵێی بەفری، میهرت بەستویەتی، راستیم پێ بێژە ئایا تۆ قاییلی ئەو جووتە بمرن؟

***بکینگهام*:** گەورەم، تۆزێکم سەبر لێ بگرە، دەرفەتێکم بدەیە تا وەڵامی ئەسەحیت بدەمەوە ***(وەدەردەکەوێ)***

***کاتسبی*:** ***(بە ئەسپایی بە یەکێك لە ئامادەبووان دەڵێت):*** پاشا تورەیە، بڕوانە چۆن لێوی دەکرۆژێ.

***ریچارد شا*** : راوێـژ بـه گـەوجانی بـێ هەسـت و پیـاوانی سـەرەڕۆ دەکـەم (لـه کورسییەکەی دێتـه خوارێ) کارم به ئاقڵان و ژیرانـەوه نییـه. "بکینگهـام"ی دوور ئەنـدێش ، فێـری مـداراکاری بـووه. ئادەی غوڵام.

***غوڵام***: بەڵێ گەورەم؟

***ریچارد شا*** : تۆ کەسێك ناناسیت، پرشنگی ئاڵتوونی فەسادئەنگێز لە خشتەی بەرێت و قەتڵێکی نهێنی ئەنجام بدات؟

***غوڵام***: ئەزبـەنی، یـەکێکی زۆر تـوڕه و بـێ ڕەزا دەناسـم، لـەو کەسـانەیه کـه هـەزارو یـەك خۆزیـای هەیـەو هیچیـان نەهاتووەتـه دی، بێگومـان بریقـەی ئـاڵتوون هێنـدەی بیسـت خـەتیبان کـاری تێدەکات، و وای لێدەکات لە هیچ کارێك نەپرینگێتەوه.

***ریچارد شا*** : ناوی چیه؟

***غوڵام***: ناوی، ئەزبەنی، تیرلە.

***ریچـارد شـا*** : نـاوم بیسـتووه، هـەر ئێسـتا بـڕۆو بیهێنـه بـۆ ئێـره، ***(خوڵامەکـە وەدەر دەکـەوێ)***، بکینگهامی زۆرزانی نێرەنگباز لە ئێستا بە دواوه شیرەتکاری من نـابێ، یـانی بـوو بـەو پیاوەی داوای مۆڵەت له من بکات، باوابێ! ***(ستانلی وەژوور دەکەوێ)***.

ها لۆرد ستانلی تۆ چ خەبەرێکت پێیه؟

***ستانلی***: سـەروەرم، بیسـتوومه گوایـه مـەرکیز دورسـت هـەڵاتووه، گەییوەتـه ئەوبـەری دەریـا و هەنووکه لای ریچموندە.

***(لەلایەکەوه دەوەستێ)***

***ریچارد شا*** : کاتسبی!

***کاتسبی***: بەڵێ قوربان؟

***ریچارد شا*** : بڕۆ لـه نێو خەڵکیدا ئـەوه بڵاو بکـەوه کـه "ئـان"ی ژنم نەخۆشـەو لەوەیـه بمـرێ. بـه خۆیشم فەرمانێك دەردەکەم کە لە کۆشك نەچێتە دەرێ و کـەس سـەردانی نـەکات. ئـەوجا بگـەڕێ پیـاوێکی گـەدازادەی گومنـاوم بـۆ بـدۆزەرەوه، تایەکسـەر کیژەکـەی کلارنسـی لـێ مـاره بکـەم، کوڕەکـەی کلارنـس منـداڵێکی گەوجـه و ترسـم لێـی نییه،چییه، بـۆ واقـت وڕمـاوه، مەگـەر خـەون دەبینی؟ تەمەشا، گوێ بگرە بۆتی دووباره دەکەمەوه: تۆ بڕۆ بڵاوی بکـەوه کـه ژنەکـەم نەخۆشـەو لـه گیانەڵڵادایـه و لەوەیـه بمـرێ. بـڕۆ و دەسـت بـه کاربـه! دەخـوازم هـەر هـەموو ئـەو هیوایانـه ریشەکێش بکەم کە لەوەیە لە ئایندەدا زەرەرم پـێ بگەیـەنن (کاتسـبی وەدەر دەکـەوێ). پێویسـته کیژی براکەم بخوازم، وا نەبێ پاشایەتییەکەم لە خەتەردا دەبێ. هەردوو براکەی دەکوژم و ئـەوجا بیخوازم، کە ڕێگەیەکی ترسناکە بەرەو سەرکەوتن! بەڵام من تازه به جۆرێ لە خوێنا نقوم بوو کـه تاوان، تاوان رادەکێشێت، جێی فرمێسکی سۆزو بـەزەیی لـەم چاوانما نـەماوه. (غوڵامەکه لەگـەڵ تیرل دا دەگەڕێتەوه). تۆ ناوت تیرله؟

***تیرل***: جیمز تیرلی نۆکەری ئەڵقە لەگوێت.

***ریچارد شا*** : جا بە ڕاستی وایت؟

***تیرل***: تاقیم بکەوە گەورەم.

***ریچارد شا*** : دەتوانی یەکێك لە دۆستەکانم بکوژی؟

***تیرل***: بەڵێ قوربان، بەڵام پێم باشە لە پێناوی رەزامەندی تۆدا، دووان لە دژمنەکانت بکوژم.

***ریچارد شا*** : دەڵێی لە دڵی منداى —دوو دژمنی سەر سەخت کە خەوو ئیسراحەتیان لێ هەڵگرتووم، جا تیرل دەمەوێ تۆ ئەو دووانەم بۆ بکوژیت، مەبەستم ئەو جووتە بیژەیە کە وان لە بورج.

***تیرل***: تۆ روخسەتی چوونە ژوورەوەم بدەیە، ئەوجا بزانە چەند بە پەلە رزگارت دەکەم لە دەستیان.

***ریچارد شا*** : قسەکەت لە گۆرانی دڵنەواز دەچێ —گوێ بگرە، وەرە پێشەوە تیرل، ئەم ئیزن نامەیە بەرەو برۆ: تو گوێت بێنە، ***(بە گوێیدا دەچپێنێ)*** ئەمە هەموو کارەکەیە، هەر بڵێ دەیکەم، بزانە چۆن لە ماڵی دنیات دەگرم.

***تیرل***: گەورەم وا بزانە تەواو بووە، هەر ئێستا بۆتی جێبەجێ دەکەم.

***ریچارد شا*** : بەر لە خەوتنان، جوابم لێ دەگێڕیتەوە تیرل؟

***تیرل***: بەڵێ سەروەرم ***(وەدەردەکەوێ)***، ***(بکینگهام دەگەڕێتەوە)***.

***بکینگهام***: گەورەم بیرم لە وەڵامی پرسیارەکەت کردەوە.

***ریچارد شا*** : وازی لێ بێنە —دورست هەڵاتووە بۆ لای ریچموند.

***بکینگهام***: قوربان، ئەم هەواڵەم بیستووە.

***ریچارد شا*** : ستانلی، ریچموند کوڕی ژنەکەی تۆیە، ئاگاداربە ها.

***بکینگهام***: گەورەم، من پاداشت و دیاریەکەی خۆمم دەوێ، ئەو دیارییەی کە بە خۆت بەڵێنت دامێ، بە خواو بەشەرەفت سوێندت خوارد کە میرایەتی هرفوردو ئەموالی مەنقولەی (هرفۆرد)م بدەیتێ. ئەو پاداشتەم دەوێ.

***ریچارد شا*** : ستانلی ئاگات لە ژنەکەت بێ، ئەگەر نامە بۆ ریچموند بنێرێ، تۆ بەرپرسیار دەبی.

***بکینگهام***: گەورەم سەبارەت بە داوا رەواکەی من چ دەڵێی؟

***ریچارد شا*** : ئەوەندەی لە بیرم بێ، کاتێ کە ریچموند هێشتا منداڵێکی لاساری چکۆلە بوو، هنری شەشەم پێشبینی ئەوەی کرد کە ریچموند دەبێ بە پاشا، پاشا، پاشا، لەوەیە.

***بکینگهام***: گەورەم!

***ریچارد شا*** : باشە ئەو فاڵبینە چۆن لەو زەمانەدا کە من لەوێ وەستا بووم، نەیتوانی پێشبینی ئەوە بکات کە من دەیکوژم؟

***بکینگهام***: گەورەم، بەڵێنی میرایەتییەکەی من...

***ریچارد شا*** : ریچموند! کە ئاخر جار لە ئیکستەر بووم، شاردار وەکو رێز بۆ من، قەسرێکی نیشاندام و گوتی (روجمونت)ی پێدەڵێن، کە گوێم لەو ناوە بوو راچڵەکیم، چونکە جارێك پێشگۆیەکی ئیرلەندی پێی گوتبووم کە دوای دیتنی ریچموند زۆر ناژیم.

***بکینگهام***: گەورەم!

***ریچارد شا*** : ئەریٚ، سەعات چەندە؟

***بکینگهام***: قوربان بیٚ ئەدەبی نەبیٚ لە رووتا، ئەو بەلێنەت بیر دەخەمەوە کە پێت دابووم.

***ریچارد شا*** : باشە، بەڵام سەعات چەندە؟

***بکینگهام***: خەریکە زەنگی دە لێدەدا.

***ریچارد شا*** : باشە، با زەنگی سەعات دە لێدا.

***بکینگهام***: مەبەستت چیە؟

***ریچارد شا*** : چونکە تۆ وەکو بەندۆڵی سەعات وای، لە نێوان داوای خۆت و خەیاڵاتی مندا بیٚ وچان دێی و دەچیت. من ئەمڕۆ ئارەزووی بەخشینم نییە.

***بکینگهام***: قوربان بیکە بە پیاوەتی خۆت و داواکەم قبولٚ بکە با ئاسوودە بم.

***ریچارد شا*** : بەڕاستی ئیزعاجم دەکەی، پێم گوتی ئەمڕۆ ئارەزووی بەخشینم نیە، ***(جگە لە بکینگهام، هەموو وەدەردەکەویٚ).***

***بکینگهام***: ئاوها؟ باشە چاکەی ئەو هەموو خزمەتە دڵسۆزانەیەی من بەم سوکایەتییە دەداتەوە؟ ئایا من بۆ ئەمەم کرد بە پاشا؟ وا چاکە عیبرەت لە کوشتنەکەی هیستینگز وەربگرم و تا سەری پڕ ترسم دانەناوە بۆ "برکنوك" هەڵێم. ***(وەدەر دەکەویٚ).***

## دیمەنی سێیەم

## هەمان دیمەن

(تیرل وەژوور دەکەوێ)

***تیرل***: تاوان، تاوانێکی زاڵمانەو خوێناوی ئەنجام درا، دزێوترین قەتڵی دڵتەزێنی سەر رووی زەمین ئەنجام درا، تەنانەت دیتون و فورست، کە ئەنجامدانی ئەم تاوانەم پێ سپارد بوون، ئەگەرچی وەکو تاژی دڕو دڕندەو خوێن خۆرن، کاتێ کارەکەی خۆیان بۆ دەگێڕامەوە، وەکو دوو منداڵی بێگەرد لە کانگەی دڵی پڕ سۆزەوە دەگریان، دیتون دەیگوت: "تەمەشا، ئەو دوو منداڵە ناسك و ئارامە، بەمجۆرە نووستبوون" فورست دەیگوت: "تەمەشا، ئەئاوا، بەمجۆرە باسکی مەڕ مەڕینی بێ تاوانیان لە ملی یەکدی وەرینا بوو، لێوەکانیان وەکو چوار گوڵە باخی سەرچڵ کە هاوین جوانی خۆی پێ بەخشی بن، یەکتریان ماچ دەکرد، کتێبێکی دوعاو نوێژان لەسەر جێگاکەیان بوو، کە خەریك بوو یەکسەر رام بگۆڕێ: بەڵام ئاه، شەیتانی —تاوانبار لێرەدا قسەکەی بڕی، بەڵام دیتون بەمجۆرە درێژەی بە قسەکەی دا: "ئیدی ئێمە بەو جۆرە جووتێ ئافەریدەی هەرە کامڵ و جوانمان کوشت کە لەوەتای تەبیعەت هەیە شتی وای بە خۆوە نەبینی بوو" ئیدی دڵیان پڕ بوو لە حەسرەت و ویژدانیان لە پەشیمانی و نەیانتوانی درێژە بە قسەکانیان بدەن. ئیدی بەو دەقەوە بەجێم هێشتن تا ئەم هەواڵە بۆ پاشای خوێنڕێژ بێنم. ئەوە هات پاشا هات! *(ریچارد شا وەژوورە دەکەوێ)* درودو سلاو لە جەنابی پاشا.

***ریچارد شا***: ها تیرلی ئازیز، هەواڵی خۆشت پێیە؟

***تیرل***: ئەگەر ئەنجامدانی ئەو کارەی پێت سپاردم دڵخۆشت دەکات، ئەوا ئەرخایەن بە گەورەم، چونکە ئەو کارە ئەنجام دراو تەواو.

***ریچارد شا***: بە چاوی خۆت مردنەکەیانت بینی؟

***تیرل***: بەڵێ ئەزبەنی.

***ریچارد شا***: ئەدی نێژران تیرلی ئازیز؟

***تیرل***: قەشەی بورجەکە ناشتنی، بەڵام نازانم چۆن و لە کوێ

***ریچارد شا***: تیرل، یەکسەر دوای شێوان وەرە بۆ لام و ئەوسا بۆم بگێڕەوە کە چۆن کوژران، دڵنیابە کە خەڵاتت دەکەم، و ئاواتەکانت دێنمە دی. جارێ تا ئەو کاتە خودا حافیز..

***تیرل***: ئەزبەنی، تکایە رێم بدە با لە خزمەتتان مەرەخەس بم،

*(وەدەر دەکەوێ).*

***ریچارد شا***: کوڕەکەی کلارنسم حەپس کردووەو لە خەڵکیم دابڕیوە. بێ هیچ دوو دڵییەك کیژەکەیم داوە بە کابرایەکی گومناوی نەناسراو، کوڕانی ئیدوارد لە باوەشی مەرگدا نووستوون،

"ئان"ی ژنم ماڵاوایی لەم دنیایە کردووە. دەبا ئێستا وەکو خوازبێنی کەرێکی شادو سەرکەوتوو خۆم بگەیەنمە کیژی براکەم، ئەلیزابتی جەوان، چونکە دەزانم ریچموند، لە شوێنی خۆیەوە، لە بەریتانییەوە بیر لە خواستنی دەکاتەوە، تا بە هۆی ئەوەوە بگاتە تەخت و تاجی پاشایەتی.
*(کاتسبی وەژوور دەکەوێ).*

***کاتسبی***: گەورەم!

***ریچارد شا*** : هەواڵی خۆشت پێیە یان ناخۆش وا بە پرتاو خۆت بە ژوورا دەکەی؟

***کاتسبی***: ناخۆش ئەزبەنی. ئیلی بۆ لای ریچموند هەڵاتووە، بکینگهام کە لەلایەن ویلزیانی شەڕڤان و جەنگاوەرەوە پشتیوانی دەکرێت، هێزی خڕکردۆتەوەو هاتۆتە مەیدان و هێزەکەی بەردەوام روو لە زیادیە.

***ریچارد شا*** : ئەوەندەی لە ئیلی و ریچموند دەترسم، لە بکینگهام و لەشکرەکەی کە بەو پەلەپرۆزێیە کۆی کردۆتەوە، ناترسم، خێراکە تەگبیرو راوێژی ترسنۆکانە، دەبێتە مایەی دواکەوتنی گەوجانە، دواکەوتنیش دەبێتە مایەی ناکامی، خێراکە، تەنیا دەست پێشکەری و تەردەستی فریام دەکەوێ، لە خەتەرم دەرباز دەکات. خێراکە وەکو پەیکی جوبیتەر باڵبگرە، بڕۆو جاڕ بدە کە پاشا بەرێوەیە، لەشکرو شەرڤانان کۆ بکەوە، ئێستا سپەرەکەم راوێژکار و رێبەرمە، نابێ کاتی خۆ بە قسان بەفیڕۆ بدەین. دەبێ دەست بە کاربین چونکە خاینان لە مەیدانی شەڕدان، و مەیدانخوازی دەکەن. *(بە جووتە وەدەردەکەون).*

## دیمەنی چوارەم

## بەردەمی کۆشك

(شابانۆ مارگرێت وەژوور دەکەوێ)

***شابانۆ مارگرێت***: ئەوا شادی خەریکە وەکو میوەیەك پێ دەگات و دەکەوێتە زاری بۆگەنی مەرگەوە، من لێرەدا لەم خەڵوەتەدا، دانیشتووم تا تەمەشای ئاوابوونی ئەستێرەی بەختی دژمنانم بکەم، ئەوەتا دەستپێکە تاڵ و شوومەکەی دەبینم، ئەمێستا بۆ فەرەنسا دەڕۆم ئومێدەوارم کە کۆتایی ئەم کارە وەکو سەرەتایەکەی تاڵ، تاریك و پشتشکێن بێ، مارگرێتی بەدبەخت هەر ئێستا وەڕێ کەوە، ئەوە کێیە وادێ؟

***(شابانۆ ئەلیزابت و دۆکبانۆ یورك وەژوور دەکەون)***

***شابانۆ ئەلیزابت***: واوەیلا بۆ جووتە میری نەوجەوانم، داخی بە جەرگم بۆ جووتە منداڵە نازەنینەکەم، بۆ ئەو دوو خونچە گوڵەی بە ناهەق هەڵوەرێنران! ئەگەر روحی ئارامتان هێشتا نەگەیووەتە قەڵەمڕەوی فەنای جاویدانی، ئەگەر هێشتا بە ئاسماندا دەفڕن، بە باڵە ناسك و هەواییەکانی خۆتان بەسەر سەرما بسوڕێنەوە، و گوێ لە ئاهو ناڵینی دایکتان بگرن.

***شابانۆ مارگرێت***: ئا بەسەر سەریا بفڕن و پێی بڵێین تۆڵەی رەوا ئێوەی بە منداڵی کوشت و رۆژی روناکی لێکردون بە شەوگاری دوورو درێژ.

***دۆکبانۆ***: بەدبەختی و بەڵای رۆژگار دەنگی بڕیوم خەم و خەفەت زمانی لاڵ کردووم، ئیدوارد پلانتاجنت تۆ بۆ مردی؟

***شابانۆ مارگرێت***: پلانتاجنت لە بری خوێنی پلانتاجنتێك چوو! ئیدواردیش لە تۆڵەی مەرگی ئیدواردێکی دی مرد.

***شابانۆ ئەلیزابت***: خودایا، تۆ چۆن لەو جووتە بەرخۆلەیە غافڵ دەبیت تا بکەونە بەردەمی گورگ؟ ئاخر تۆ کەی خەوتووی، تا لە کاتی ئەنجامدانی ئەم تاوانەدا بنووی؟

***شابانۆ مارگرێت***: ئەو کاتە خەوت کە هاری موبارەك و بێ تاوان، و کوڕە ئازیزەکەی من کوژران.

***دۆکبانۆ***: ئەی چاوانی نابینا، ئەی ژیانی مردوو، ئەی تاپۆی بەناو زندووی ناو زندووان، ئەی وێنەی کوێرەوەری و ئەی نەنگ و شەرمەزاری ژیان، ئەی زندوو داگیرکەری مافی گۆڕ، ئەی تۆماری رۆژگارانی کوێرەوەری، خودی ماندووت لە خاکی ئینگڵتەرا، ئەو ئینگڵتەرایەی رۆژگارێك مەڵبەندی یاساو رێسایان بوو، و ئەمێستا بەبێ قانوونی، بە خوێنی بێگوناهان مەستە، خۆت رزگار بکە، ئاسوودەیی بەبێ ئارامی خۆت ببەخشە. ***(دادەنیشێت)***.

***شابانۆ ئەلیزابت:*** ئاه، ئەی خاکی ئینگڵتەرە، مادامێکی ناتوانی تەختێکی خەمگینم بۆ فەراهەم بکەی، کەوایە گۆڕێکم بۆ ئامادە بکە، تا ئێسکەکانمی تیا بنێژم، و چیتر نەبمە بار بەسەر ئەم خاکەوە، ئاه خەم و گریان هەر بۆ من باشە! کێ هێندەی من شایستەی خەمە! *(لای دۆکبانۆوە دادەنیشێت).*

***شابانۆ مارگرێت***: ئەگەر گەورەیی و رێزی خەم بە کۆنی بێ، ئەوا

خەمی من سەر قافڵەو پێشەنگە،

با سکاڵای من بەرزترین جێگە بگرێ،

ئەگەر خەمێك، بە خەمی خەڵکانی دی هێور بێتەوە،

*(لە تەنیشتی ئەوانەوە دادەنیشێت)* ئەوا بڕواننە خەم و کڵۆڵی من تا سوکنایی دڵتان بێ.

من ئیدواردێکم"١" هەبوو، ریچارد کوشتی

تۆ (هاری"٢")یەکت هەبوو، ریچارد کوشتی

تۆ ئیدواردت"[3]" هەبوو، ریچارد کوشتی

و تۆ ریچاردت"[4]" هەبوو، ریچارد کوشتی.

***دۆکبانۆ***: منیش ریچاردێکم هەبوو کە تۆ کوشتت، ئێستاش روتلاندم هەیەو دەتەوێ بکوژرێ.

***شابانۆ مارگرێت***: هەروەها کلارنست هەبوو، و ریچارد کوشتی، ئەمە بەشەر نەبوو، سەگێکی دۆزەخی بوو و لە منداڵدانی تۆوە داخزی تا هەمووومان بکات بە نێچیری مەرگ، سەگێك بەر لەوەی چاوانی بپشکون، دان و کەڵبەی دەرکرد، تا بەرخۆلانی پێ هەڵدڕێ و خوێنی پاکیان بخواتەوە، تا دەستکردانی خودا بشێوێنێ و بلەوتێنێ. ئەو زۆردارەی لەم سەر زەمینەدا کەس ناوێرێ چاوانی لەبەر هەڵێنێ، ئەو چاوانەی گریانی خەمامێزی خاوەنەکانیان، هێناونیەتە گل. ئەو سەگە لە منداڵدانی تۆوە داخزیوە تا هەموومان لە گۆڕ بنێ.

ئەی پەروەردگاری چاکەکار، ئەی دادپەروەرو میهرەبان، ئەی تۆڵە ئەستێن، ئاخر من چۆن سوپاسگوزاری تۆبم، کە بە چاوی خۆم دەبینم، ئەم سەگە زاڵمە، ئەم تینووی خوێنەت بەرەڵڵاکردووە، کە تەنانەت روحم بە منداڵەکانی دایکی خۆیشیا ناکات و پەلاماریان دەدات و هەڵیاندەدرێ و کارێکی وەها دەکات کە دۆستەکانی لەگەڵ دژمنەکانیا بگرین!

دۆکبانۆ: ئەی ژنی (هاری)، بە خەم و دەردی من خۆش مەبە، خودا بەخۆی شایەتە من بۆ خەم و دەردی تۆ گریاوم.

***شابانۆ مارگرێت***: لێم مەگرن! تەحەمولم بکەن! من تینووی تۆڵەم و ئەمێستا بە دیتنی ئەو تۆڵەیە روحم تێر دەکەم، ئیدواردی کوڕت، کە ئیدواردی کوڕی کوشتم، مرد. ئیدواردەکەی دیکەت، لە تۆڵەی مەرگی ئیدواردی من کوژرا، یورکە چکۆڵەش تەنیا تەواوکەری ئەو تۆڵەیە بوو، چونکە بە هەردووکیان هاوتای کوڕەکەی منیان نەدەکردەوە، کلارنسی تۆ کە ئیدواردی منی کوشت، مرد، بەڵام هیستینگزی داوێن پیس و ریڤەرز، ڤوگان وگری — ئەو خاینانەی ئەو کارەساتەیان بینی،

---

١-ئیدوارد: کوڕی هنری شەشەم.

٢-هاری: هنری شەشەم لە ژنەکەی

[3] – ئیدوارد: ئید واردی پێنجەم

[4] – ریچارد: دۆك یورکی نەوجەوان.

هەر بە لاوی گۆڕی تاریك و نوتەك قووتی دانن بەڵام ریچارد هێشتا وەکو نوێنەری دۆزەخی رەش لە ژیاندایە، بۆ ئەوە ماوە تا روحان بکێشێ و بۆ دۆزەخیان بنێرێ. بەڵام ئەویش دوا دواییەتی، و کۆتاییەکی پڕ ژان و سوێ چاوەڕوانیەتی، زەوی شەق دەبا، دۆزەخ کڵپە دەسەنێ، هەریمەنان هاوار دەکەن، و پیاوچاکان نوێژو نزا دەکەن، لە خوا دەپاڕێنەوە کە بەزووترین کات فەوت و فەنای بکات. ئەی خوای دلۆڤان، لێت دەپاڕێمەوە کە ژیانی لە لەوحی مەحفوزا بسڕەوە، و ئەوەندەم مەودا بدە پڕ بە زار هاوار بکەم، ئۆخەی: *"ئەو سەگە تۆپی!"*

***شابانۆ ئەلیزابت***: ئاه! تۆ هەر زوو پێشبینی ئەوەت بۆکردم کە رۆژێ دێ، داوات لێ بکەم کە بێی پێکەوە نەفرەت لەو جاڵجاڵۆکە هەڵئاوساوە، لەو بۆقە قەمورە ژاراویە بکەین!

***شابانۆ مارگرێت***: من ئەوسا پێم دەگوتی سێبەرو دیمەنێکی بۆش و بە تاڵی شکۆداری منی، پێم دەگوتی سێبەرێکی کاڵ و وێنەیەکی درۆینەی شابانۆیت، لە راستیا تارماییەکی بێ نموودی حەقیقەتی من بووی، کەسێ بووی گەیەنرا بووە لوتکە، تا توڕ بدرێتە هەڵدێرەوە، دایکێ بووی کە قەدەر بە گاڵتەوە دوو منداڵی شیرینی دابوویە، خەونی رابردووی دابوویە، هەمووی یەك هەناسە بوو، یەك بڵقی سەر ئاو بوو، تەنیا شکۆیەکی هەبوو، کە بە ناو شکۆ بوو، بەیداخێکی بە بریق و باق بوو تا ببێ بە نیشانەی هەر تیرێکی خەتەرناك، رواڵەتی کۆمێدی شابانۆیەك بوو، تەنیا بۆ ئەوەی دیمەنێك پڕ بکاتەوەو خەڵکی کاتی پێ رابوێرن. دەی ئێستا کوا مێردەکەت؟ کوا براکانت؟ کوا کوڕەکانت؟ شادی و بەختەوەریت کێوە چوو؟ کوان ئەوانەی لێت دەهاتنە پێشێ و هورایان بۆ دەکێشایت: *"بژی شابانۆ با؟!"* کوان ئەو نەجیمزادانەی ریاکارییان لەبەر دەکردی؟ کوا ئەو سەربازانەی بەگەڵ کاروانەکەت دەکەوتن؟ هەر هەموو ئەمانە لە هەوەڵەوە تا کۆتایی بێنە بەرچاوی خۆت و بڕوانە ئێستا چیت؟ لە ژنێکی بەختەوەرەوە بوویت بە کلۆڵترین و نا ئومێد ترین بێوەژن، لە دایکێکی دڵخۆشەوە بووی بە کەسێك وشەی دایك کزە لە جەرگت هەڵدەستێنێ، لە شابانۆوە بووی بە بەندەیەکی ترسنۆك و تاجی سەرت کلۆڵی و نەگبەتیە، جاران خەڵکی لەبەر تۆ دەپاڕانەوە، ئێستا تۆ کەساس و زەبوون لەبەر خەڵکی دەپاڕێیتەوە. جاران تۆ گاڵتەت بە من دەکرد، ئێستا تۆ مایەی گاڵتەی منی، جاران هەموو کەس لێت دەترسان، ئێستا تۆ لە هەندێ کەسان دەترسیت، جاران هەموو کەس گوێڕایەڵت بوون، ئێستا کەس گوێت لێناگرێ، ئیدی چەرخی عەدالەت وەرسوڕاوەو بووی بە نێچیرێکی داماوی رۆژگار، جگە لە بیرەوەری رابردوو هیچ شتێکی دی شك نابەی، ئەو رابردووەی کە لەگەڵ ئێستاتدا بەراوردی دەکەی هێندەی دی دەردت گران دەبێ، کاتی خۆی شوێنەکەت لێ زەوت کردم، ئایا ئێستا ناتەوێ بەشی هەرە گەورەی خەمەکەیشم لێ زەوت بکەی؟ ئێستا نیوەی تەوق و نیرە قورسەکەی من بەسەر ملی ئەستورو لە خۆبایی تۆوەیە، منیش نیوەکەی تری لە گەردنی لاوازو ماندووی خۆم دادەماڵم و هەموو قورساییەکەی بە تۆ دەسپێرم. بە دوعا ئەی ژنی یورك، و بە دوعا ئەی شابانۆی بەختی رەش و کول و کۆڤان. لە فەرەنسادا، بەم خەمانەی ئینگلتەرا پێدەکەنم.

***شابانۆ ئەلیزابت***: وای کە وەستای لە تووك و نەفرەتان، کەمێك بوەستە، فێرم بکە چۆن تووك و نەفرەت لە دژمنەکانم بکەم.

***شابانۆ مارگرێت***: بە شەوان مەخەوە، بە ڕۆژان بە ڕۆژوو بە، شادمانی مردوو، لە دەست چوو، لەگەڵ خەم و پەژارەی زندوو، و ئێستایا بەراورد بکە، جووتە کوڕەکەت جوانتر لە خویان بێنە بەر چاوی خەیاڵت، بکوژەکەیان لە حەقیقەتی خۆی دزێوترو دڕندەتر بێنە بەرچاوی خەیاڵت، چونکە تا کارەسات و بەلایەکەت گەورەتر بنوێنیٚ، سەبەبکارەکەت زیاتر لا نا شیرین و بەدتر دەبیٚ، رامان و تێفکرین لەو شتانە فێرت دەکات چۆن تووك و نەفرین داباریٚنی.

***شابانۆ ئەلیزابت***: قسەکانم کول و بیٚ گیانن، بە وشەکانت دەمەزەردو تیژ تریان بکەوە.

***شابانۆ مارگرێت:*** خەمەکانت لە هەسانیان دەدەن و وەکو وشەکانی من تیژیان دەکەن. ***(وەدەردەکەویٚ).***

***دۆکبانۆ***: باشە بۆچی دەبیٚ کارەسات و بەڵاو مسیبەتان بە وشە بێتە دەربڕین؟

***شابانۆ ئەلیزابت***: چونکە هەوایەکە و خەمی خاوەنەکەی دەبا، میراتگری بێهودەی خۆشی و شادیانی لە دەست چووە، هەناسەیەکەو گوزارشت لە خەم و کوێرەوەری ناخمان دەکات. جا ڕێی لیٚ مەگرە، هەر چەند هیچ سوودێك ناگەیەنیٚ، بەڵام جۆرە ئاسودەییەك بە دڵان دەبەخشێت.

***دۆکبانۆ***: ئەگەر ئاوایە، زمانی خۆت مەگرە، وەرە با پێکەوە هەناسەمان بە وشەی ژاراوی و تاڵ بسپێرین، تا کورە مەلعونەکەی من، کە دوو کوڕە جوانەکەی تۆی کوشت، بکوژین. گوێم لە دەنگی تەپڵەکانیەتی، تۆ بلورینە، هاواری خۆت بکە.

***(ریچارد شا وەژوور دەکەویٚ، لەسەر نەزمی تەپڵ و دەنگی شەیپوران رێدەکات.)***

***ریچارد شا***: ئەوە کێیە ریٚمان لێدەگریٚ؟

***دۆکبانۆ***: ئەو کەسەیە، کە دەبوایە کاتی خۆی رێت لیٚ بگریٚ، و لە منداڵدانی خۆیدا خەفەی کردبای، لە باری بردبای، تا ئەم هەموو کوشتارەت نەکردبا، تا ئەم هەموو کارەساتەت بەسەر خەڵکیدا نەهێنابا.

***شابانۆ ئەلیزابت***: حەیفیٚ، سەری تۆو تاجی زێڕێن؟ هەق نەماوە، ئەگەر هەق مابا، دەبوایە سەری تۆ بە ئاگر داغ بکریٚ، چونکە شازادەی هەقداری راستەقینەی ئەو تاجەت کوشت، چونکە بە ناهەق هەردوو کوڕەکەم و براکانت کوشتم، ئەی بەندەی تاوانبار، پێم بڵیٚ کوا کوڕەکانم؟

***دۆکبانۆ***: ئەی بۆق، ئەی بۆق، کوا کلارنسی برات، کوا پلانتاجنتی کورە چکۆلەی؟

***شابانۆ ئەلیزابت***: کوا ریڤەرزی میهرەبان، کوا ڤوگان و گرای؟

***دۆکبانۆ***: هیستینگزی دلۆڤان لە کوێیە؟

***ریچارد شا***: ئادەی شەیپورچیان فوو بە شەیپورەکانتانا بکەن، ئادەی دۆڵەنگێوان، دۆڵان بکوتن، تا ئاسمان گوێی لەم دوو ژنە دوو زمانە نەبیٚ، کە جنێوان بە هەڵبژاردەی خودا دەدەن، لەگەڵ ئێوەمە، دۆڵان بکوتن –شەیپوران بژەنن! ***(دەنگی دۆڵ و سەدای شەیپور بەرز دەبێتەوە)*** یا ئەوەتا هێور دەبن و قسەی جوان دەکەن، یا بەو جۆرە هاوارو سکاڵاکانتان لە مارشی جەنگدا غەرق دەکەم.

***دۆکبانۆ***: تۆ کوڕی منی؟

***ریچارد شا***: بەڵیٚ، سوپاس بۆ خوا کە کوڕی بابم و تۆم.

***دۆکبانۆ***: کەواتە بە سەبرەوە گویٚ لە بیٚ سەبریم بگرە.

***ریچارد شا*** : ئەزبەنی، لە هەندیٚ تەبیعەتدا چوومەتەوە سەر تۆ، بۆیە تەحەمولی تانەو تەشەران ناکەم.

***دۆکبانۆ***: راوەستە، با قسە بکەم.

***ریچارد شا:*** تۆ قسە بکە، بەلاٌم من گویٚ ناگرم.

***دۆکبانۆ***: قسەی رەق ناکەم.

***ریچارد شا*** : بەلاٌم بە کورتی دایکە گیان، چونکە پەلەمە.

***دۆکبانۆ***: ئاوا، ئەوەندەت پەلەیە؟ خودا دەیزانیٚ چەدم ژان و ئازارو دەردو عەزاب بە تۆوە چەشتووە.

***ریچارد شا*** : باشە من بۆ ئەوە لە دایك نەبووم، کە ببمە مایەی دڵخۆشی تۆ؟

***دۆکبانۆ***: نەخیٚر، نە بە خاچی پیرۆز! بە خۆت چاك دەزانیت، تۆ بۆ ئەوە هاتیە ئەم دنیایە، تا دنیام لیٚ بکەی بە دۆزەخ، لە دایکبوونی تۆ، باریٚکی گران و بە ئازار بوو، لە مندالٌیا، مندالٌیٚکی لاساری خۆسەری کەللەشەقی شەڕانی بووی، لە قوتابخانەدا ترسناك، رەش بین، دڕو توڕە، و دڕندە خوو بووی، لە گەنجیٚتی دا، سەرکیٚش، گوساخ و بیٚ باك وپەروا بووی، ئیٚستاش کە لە تاڤ تەمەندایت، غەڕاو نیٚرەنگباز، خاپینۆك و خاین و خویٚنڕیٚژیت، هەر چەندە تۆزیٚ هیٚورتر بووی، بەلاٌم زۆر موزیٚرتر بووی، رق و کینەت لە ژیٚر پەردەی بەزەیی و دلۆڤانیدا دەشاریٚتەوە. ئیدی پیٚم نالٌیی من لە چ سەعاتیٚکدا لەگەلٌ تۆدا ئاسودە دڵ و سەرفراز بووم؟

***ریچارد شا*** : بە گیانی خۆم، لەوە دەچیٚ لە سەعاتەکەی "هومفری*"دا بووبیٚ، ئیدی لەو سەعاتەدا چوویت بۆ شیو خواردن و لە خۆشی و هاودەمی من مەحروم بوویت، جا کە ئەوەندە بە دیتنی من ناڕەحەتی، ریٚمکە با بڕۆم و نەبمە مایەی ناڕەحەتیت، ئادەی دۆلاٌن بکوتن!

***دۆکبانۆ***: تکایە گویٚ لە قسەی من بگرە.

***ریچارد شا*** : قسەکانت زۆر رەقن.

***دۆکبانۆ***: تەنیا یەك قسەم لیٚ ببیستە، چونکە چیتر قسەت دەگەلٌ ناکەم.

***ریچارد شا*** : ئاوها؟

***دۆکبانۆ***: بەلٌیٚ، چونکە یا عەدالەتی خوایی دیٚتە دی، و بەر لەوەی بەسەرکەوتووی لەم جەنگە بگەڕیٚیتەوە دەمریت. یان خەم و پیری من دەکوژن و جاریٚکی دی چاوم بە چارەت ناکەویٚ. دەیسا بڕۆ قورسترین نەفرینی منت لەگەلٌ، ئومیٚدەوارم لە هەر هەموو ئەو زریٚیانەی لە بەرت کردوون، زیاتر دەورت بگریٚ. ئومیٚدەوارم تووك و نەفرینی من شان بە شانی دژمنەکانت دژی تۆ بجەنگن، روحی هەردوو کوڕە چکۆلەکەی ئیدوارد، بەگویٚی روحی دژمنەکانتا بچپیٚنن و زاتیان

---

* "سەعا تی هومفری" : رەخنەگران رای جیاوازیان لەمەڕ لیٚکدانەوەی دەستەواژەی ( سەعاتەکەی هومفری ) هەیە، ما قولترین رەئی ئەوەیە کە شەکسپیر ویستویەتی بەم کینا یە یە ئاماژە بۆ ئەو بەرەڵلاٌیانە بکات کە نا توانن نا نی خۆ بکڕن یان سوالٌ بکەن، بۆیە پەنا وەبەر کلٌیٚسای سەنت بوترس دەبەن کە گوایە مەزاری "بوشان"ی تیا یە، و عەوامی خەلٌکیش پیٚیان وایە ڤە برو مەزاری هومفریە، تا لەویٚ نان بخۆن، بۆیە وەکو پەند بەو هەژارو دەستکورتا نە دەگوتریٚ: شیو لەگەلٌ دوك هومفریدا دەخوا.

وەبەر بخەن و مژدەو بەڵێنی سەرکەوتنیان بدەنێ، تۆ کەسێکی خوێن ڕێژی و ژیانت بەخوێن دەبڕێتەوە. لەوەتەی هەی شەرمەزاری وەکو سێبەر بە دوای ژیانتەوەیە. دیارە لە مەرگیش دا هەر دەست بەردارت نابێ. *(وەدەر دەکەوێ.)*

***شابانۆ ئەلیزابت***: هەر چەند بیانووی تووك و نەفرینی من یەجگار زۆرە، بەڵام دڵ و دەروون و حەوسەڵەی نەفرینم نیە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، بە هەموو ئەم تووك و نەفرین و دوعایانەی ئەو دەڵێم ئامین.

***ریچارد شا*** : راوەستە خانم، دەبێ چەند قسەیەکت لەگەڵ بکەم. *(دەیباتە کەنارەوە)*

***شابانۆ ئەلیزابت***: من چ کوڕێکی شازادەم نەماون تا بیانکوژی. کیژەکانیشم، ریچارد ، دەبن بە دێرنشینانی وێردو دوعاخوێن، نەك بە شابانۆیانی چاو بەگریان، کەواتە ژیانیان مەکە بە نیشانەی تیری خۆت.

***ریچارد شا*** : بەڵام تۆ کیژێکت هەیە بە نێوی ئەلیزابت کیژێکە سەلارو جوان، نەجیمزادەیەو لە خوێنی شاهانەیە.

***شابانۆ ئەلیزابت***: جا لەبەر ئەو شتانە بمرێت؟ ئاه! وازی لێ بێنە با بۆ خۆی بژی. من خیلقەتی دەلەوتێنم، جوانیەکەی دەشێوێنم، پەردەی نەنگ و ریسوایی بەسەر کیژەکەمدا دەدەم تا دوور لە قەسابخانەی خوێنین بژی، بە خۆم بڵاوی دەکەمەوە کە زۆڵەو لە ئیدوارد نیە.

***ریچارد شا*** : زوڵم لە رەگ و رەچەڵەکی مەکە، چونکە ئەسڵزادەیەو لە خوێنی شاهانەیە.

***شابانۆ ئەلیزابت***: بۆ ئەوەی ژیانی رزگار بکەم، دەڵێم وانیە.

***ریچارد شا*** : ئەسڵ و فەسڵی باشترین زامنە بۆ ژیانی.

***شابانۆ ئەلیزابت***: ئاخر، برایەکانیشی بە هەمان زامن مردن.

***ریچارد شا*** : نەخێر، بەڵکو خۆیان لە رۆژو سەعاتێکی نەحس و شوومدا لە دایك بوون.

***شابانۆ ئەلیزابت***: نەخێر، بەڵکو دۆستانی بەدو بودەڵە نەحسییان بە ملا هێنان.

***ریچارد شا*** : کەس لە چارەنوس قوتار نابێ.

***شابانۆ ئەلیزابت***: ئەمە کاتێ وایە کە شەڕو بەدفەڕی، لادان لە خێرو چاکە، بە تۆبزی چارەنووس بسەپێنێ، ئەگەر بە مەرحەمەت و میهری خودایی تۆ ژیانێکی باشترت هەبووایە، قەدەرو چارەنووس وای دەخواست کە کوڕەکانی من مەرگێکی چاکترو عادیلانەتریان بە نەسیب بوو بووایە.

***ریچارد شا*** : تۆ بە شێوەیەك قسان دەکەی وەکو ئەوەی من برازاکانی خۆم کوشتبێ.

شابانۆ ئەلیزابت: برازاکانت! ئەو برازایانەی مامیان شادی، هەقی پاشایەتی، خزمایەتی، و ئازادی و ژیانی لێ زەوت کردن. ئەو دەستەی کە دڵی ناسکی ئەنجن ئەنجن کردن، بە تەگبیری تۆ جولا . هەڵبەتە ئەو کێردە کوشندەیە کول بوو بوو، لە دەم کەوتبوو، ئەوە بوو بە دڵی بەردینی تۆ تیژ کرایەوە، تا هەناوی دوو بەرخۆلە هێمن و ئارامەکەی من دادڕێ. بە هەر حاڵ باسکردنی بەردەوامی خەم، لە تیژی و توندی خەم کەم دەکاتەوە بۆیە نابێ زمانی من لەوەی پتر ناوی کوڕەکانم بە گوێی تۆدا بدات، ئەو کاتانە نەبێ کە نینۆکەکانم لە چاوانی تۆدا لەنگەربگرن و من

لەم کەنداوی مەرگەدا، وەکو بەلەمێکی سەرگەردانی چارۆکە دڕاوی پەت پچڕاو، خۆم بە تاوێری دڵی تۆدا بکێشم و پارچە پارچە ببم.

***ریچارد شا*** : خانمەکەم، یاخوا هێندەی من چاکەی تۆو کیژەکانتم دەوێ، ئەوەندە لەم کارە پڕ خەتەرو جەنگە خوێناوییەی بەرەو پیری دەچم خێرو سەرکەوتنم بێتە رێ.

***شابانۆ ئەلیزابت***: ئاسمان چ خێرو خۆشییەکی لێ حەشار داوم، تاتۆ بتوانی پەردەی لەسەر لابدەی و بەمنی ببەخشی؟

***ریچارد شا*** : بەرزبوونەوەو پێشکەوتنی کیژەکانت، بانۆی بەڕێز.

***شابانۆ ئەلیزابت***: بەرەو قەنارە تا لەوێ سەریان تیا بچێ؟

***ریچارد شا*** : نەخێر، بەرەو عیزەت، و سەربەرزی بەرەو شکۆو شانازی، بەرەو تاجی شکۆمەندی شکۆی ئەم خاك و سەرزەمینە.

***شابانۆ ئەلیزابت***: دەی خەمەکانم بلاوێنە، مەراییان بکە، بڵێ بزانم تۆ دەتوانی چ پلەو پایەو چ عیزەت و شەرەف و شکۆیەك بە یەکێك لە کیژەکانم ببەخشیت؟

***ریچارد شا*** : هەر چیم هەیە، تەنانەت خۆمیش لە قەبێڵی یەکێك لە کیژەکانت دەکەم، تا روحی تووڕەت یادی خەمناکی ئەو زوڵمەی کە وا تێ دەگەی من دەرهەق بە تۆ کردوومە، بە دەریای بیرچوونەوە بسپێرێ.

***شابانۆ ئەلیزابت***: لە کورتی بیبڕەوە، سۆز فرۆشیمان بەسەرا مەکە.

***ریچارد شا*** : کەواتە چاك بزانە کە لە کانگەی گیانمەوە کیژەکەتم خۆش دەوێ.

***شابانۆ ئەلیزابت***: بەڵام دایکی کیژەکەم لە کانگەی گیانییەوە باوەڕی وایە کە....

***ریچارد شا*** : باوەڕی وایە کە... چی؟

***شابانۆ ئەلیزابت***: کە روح و گیانی تۆ زۆر دوورە لە خۆشەویستی کیژەکەم، چەند براکانیت خۆش ویست، هەر ئەوەندەت خۆش دەوێ، بۆیە لە ناخی دڵەوە سوپاست ناکەم.

***ریچارد شا*** : پەلە مەکە، با بە هەڵە لێم حاڵی نەبی، مەبەستم ئەمەیە کە بە دڵ و گیان، لە ناخی روحەوە کیژەکەتم خۆش دەوێ و دەمەوێ بیکەم بە شابانۆی ئینگڵتەرا.

***شابانۆ ئەلیزابت***: پێم ناڵێی بە تەمای کێ بکەی بە شای کیژەکەم؟

***ریچارد شا*** : ئەو کەسەی کە دەیکات بە شابانۆ، چما کەسی تر هەیە؟

***شابانۆ ئەلیزابت***: چی؟ تۆ؟

***ریچارد شا*** : بەڵێ من. تۆ چ دەڵێی؟

***شابانۆ ئەلیزابت***: باشە چۆن دەتوانی رازی بکەی؟

***ریچارد شا*** : دەمەوێ تۆ رێم پێ نیشان بدەی، چونکە تۆ لە هەموو کەس باشتری دەناسیت.

***شابانۆ ئەلیزابت***: بەڕاست دەتەوێ من رێت نیشان بدەم؟

***ریچارد شا*** : لە ناخی دڵەوە، خانم.

***شابانۆ ئەلیزابت***: کەواتە بە بکوژی براکانیا جووتێ دڵی خوێناوی بۆ بنێرە، ناوی ئیدوارد لەسەر یەکێکیان هەڵکەندرابێ و ناوی یورك لەسەر ئەوی تریان. لەوەیە لەو کاتەدا دەست بە

گریان بکات، ئەوکاتە وەکو چۆن مارگریت کاتی خۆی دەسرۆکەیەکی خلتانی خوێنی "روتلاند"ی بۆ بابت نارد بوو تۆش دەسرۆکەیەك بۆ کیژەکەم بنێرە و بڵێ کە تۆ بەو دەسرۆکەیە خوێنی ئالی برا جوانەکانیت وشك کردووەتەوە، داوای لێ بکە کە بەو دەسرۆکەیە فرمێسکی چاوانی گریاوی وشك بکاتەوەو بسڕێ. ئەگەر بەمە نەهاتە رەداو دڵی نەرم نەبوو و خۆشی نەویستی، هەنگێ چیرۆك و حیکایەتی شاکارەکەتی بۆ بنێرەو پێی بڵێ کە تۆ مامە کلارنسیت کوشت، خاڵە ریڤەرزیت کوشت، بەڵێ، پێی بڵێ لە پێناوی ئەودا پورە ئازیزەکەیت "ئان"ت لە نێو برد.

***ریچارد شا*** : تۆ گاڵتەم پێدەکەی خانمەکەم. ئەمە رێگەی رازی کردنی کیژەکەت نیە.

***شابانۆ ئەلیزابت***: هیچ رێگەیەکی دی نیە، مەگین تۆ خۆت بگۆڕی و ببی بە ئینسانێکی دیکەی جیا لەم ریچاردەی کە ئەم هەموو تاوانەی کردووە.

***ریچارد شا*** : پێی دەڵێم هەر هەموو ئەمەم لەبەر خاتری خۆشەویستی ئەو کردووە.

***شابانۆ ئەلیزابت***: لەم حاڵەتەدا هیچ چارێکی نابێ تەنیا ئەوە نەبێ کە نەفرەتت لێبکات، چونکە ئەو خۆشەویستییەت بەو تاوانە خوێنینە کڕیوە.

***ریچارد شا*** : گوێ بگرە، ئەوەی چوو چوو، ئەوەی روویدا چاك ناکرێتەوە، خەڵکی هەندێ جار ناتوانن خۆ لە کارو کردەوەی بێ ئەقڵانە بپارێزن، کەچی دوای ماوەیەك لە کرداری خۆ ژێوان دەبنەوە. ئەگەر پاشایەتیم لەکوڕەکانت داگیر کردووە، ئەوا لە تۆڵەی ئەوەدا دەیدەمەوە بە کیژەکەت. ئەگەر زادەی منداڵدانی تۆم کوشتبن، ئەوا کوڕان لە کیژەکەت دەخەمەوە تا نەوەت زۆر بکەم. ناوی داپیرە لە رووی خۆشەویستییەوە چی وای لە ناوی جوان و پڕسۆزی دایك کەمتر نیە. نەوەش تامی فەرزەند دەدا، با پلەیەکیش پاینتر بن، خۆ لە نەسڵی تۆن، تەبیعەت و خوێنی تۆ هەڵدەگرن، بەدەم هەمان ژانەوە لە دایك دەبن، کیژەکەت ئەو ژانەیان لە پێناودا تەحەمول دەکات کە تۆ لە کاتی بوونی ئەودا تەحەمولت کردووە، لە کاتی گەنجیتا منداڵەکانت مایەی ئازارت بوون، بەڵام منالەکانی من دەبنە مایەی ئاسودەیی و دڵخۆشی قۆناغی پیریت. تۆ تەنیا کوڕە پاشایەکەت لە دەست داوە، لە جیاتی ئەوە کیژەکەت دەبێتە شابانۆ. من ناتوانم وەکو پێویست و بەدڵی خۆم تۆڵەت بۆ بکەمەوەو قەرەبووی هەموو شتێکت بۆ بکەمەوە، کەواتە رێزو خۆشەویستیم قەبوڵ بکە، هەنگێ دوای ئەم خزمایەتی و تێکەڵ بوونە موبارەکە، دورستی کوڕت زوو بە زوو لە وڵاتی بێگانە، لەوڵاتی ترس و ناڕەحەتییەوە بۆ ئینگڵتەرا بانگ دەکرێتەوە تا پۆستی بەرزو شکۆی گەورەی پێ بسپێردرێت. دیارە ئەو پاشایەی کە بە کیژە جوانەکەی تۆ دەڵێت ژنەکەم، بێ دوو دڵی و بە پێی عادەت بە "دورست"ش دەڵێ براکەم*، تۆش جارێکی دیکە دەبیتەوە بە دایکی* پاشا، خۆشی و شادمانی دوو چەنانە، هەر هەموو وێرانی و مسیبەتەکانی رۆژگار دەسڕێتەوە. زۆر رۆژانی خۆشمان لە پێشە ئەو فرمێسکە رەوانانەی کە هەڵت رشتن، لە شێوەی مرواری گەشدا دەژێنەوە، و شادی و بەختەوەری خۆت زۆر بە زیادەوە بەدەست

---

* بە پێی دابی خزمایەتی ژن برا، وەکو برا حەساو دەکرێ.

* خەسوو لە عورفی کۆمەڵایەتی دا ، وەکو دایك حەساو دەکرێ.

دێنیتەوە، کەواتە دایکە! بڕۆ بۆ لای کیژەکەت، بە زەبری ئەزموونی خۆت شەرمی لاوێنی بشکێنەو ئامادەی بکە بۆ بیستنی داستان و چیرۆکی ئاشقێنی داواکارەکەی. پشکۆی پڕ ئومێدی سەڵتەنەتی زێڕین لە دڵە ناسکەکەیدا بگەشێنەوە، باسی ساتە شیرین و ئارام و پڕ لەزەتەکانی شووکردن بۆ شازادەخانم بکە، جا پاش ئەوەی بەم دەستانەم، بکینگهامی گەوج و بێ مێشك، ئەو یاخییە هیچ و پوچە تەمبێ دەکەم و دەیکەم بە عیبرەت، هەنگێ بە تاجە گوڵینەی سەرکەوتنەوە دەگەڕێمەوە، و کیژەکەت دەگوازمەوە و دەیکەمە پەردەوەو ئەوسا چیرۆکی سەرکەوتنی خۆمی بۆ دەگێڕمەوە، ئەو سەرکەوتنەی هەر بۆ ئەو دەبێت.

***شابانۆ ئەلیزابت***: چی پێ بڵێم: پێی بڵێم براکەی بابت دەیەوێ بتخوازێ؟ یا پێی بڵێم مامت؟ یان بڵێم بکوژی جووتە براو خاڵەکانت؟ ئاخر بە چ ناوێکەوە داخوازی بکەم کە خواو یاساو قانوون و شەرەف و حەزو ڤیانی دڵی ئەو پێی رازی بێ؟ چۆن ئەو ناسکە بارە بێنمە رەدا کە بە تۆ رازی بێ؟

***ریچارد شا*** : بە ناوی ئاشتی و سەلامەتی ئینگڵتەراوە، پێی بڵێ ئاشتی و سەلامەتی ئینگڵتەرا لەو خزمایەتییەدایە.

***شابانۆ ئەلیزابت***: ئاشتیەك کە ئەو بە بەهاونرخی جەنگێکی هەمیشەیی دەیکڕێت.

***ریچارد شا*** : پێی بڵێ ئەو پاشایەی کە دەتوانێ ئەمر بکات، لێت دەپاڕێتەوە.

***شابانۆ ئەلیزابت***: ئەو کارە بکات، کە پاشای پاشایان (خوا) حەرامی کردووە؟

***ریچارد شا*** : پێی بڵێ دەبێ بە شابانۆیەکی شکۆدار و بە قەدر.

***شابانۆ ئەلیزابت***: تا دوایی وەکو ئێستای دایکی شینی لە دەست دانی ئەو عینوان و لەقەبە بگێڕێ!

***ریچارد شا*** : پێی بڵێ تا ئەبەد خۆشم دەوێ.

***شابانۆ ئەلیزابت***: بەڵام ئەو عینوان و لەقەبە (شابانۆ) تا کەنگێ بەردەوام دەبێ؟

***ریچارد شا*** : تا کۆتایی ژیانی جوان و موبارەکی، هەر جوانی و شیرینی لێ هەڵدەهێنجێ.

***شابانۆ ئەلیزابت***: باشە ژیانی جوان و مبارەکی، تا چەند بە خۆشی بەردەوام دەبێت؟

***ریچارد شا*** : تا ئەوکاتەی ئاسمان و تەبیعت مەودای ژیانی بدەن.

***شابانۆ ئەلیزابت***: تا ئەو کاتەی دۆزەخ و ریچارد بیانەوێ.

***ریچارد شا*** : پێی بڵێ من کە پاشای ئەوم، خۆم بە رەعیەتێکی ڤیانی ئەو دەزانم.

***شابانۆ ئەلیزابت***: بەڵام ئەو کە رەعیەتێکی تۆیە نەفرەت لە پادشای واهی دەکات.

***ریچارد شا*** : تۆ کە باسی منی بۆ دەکەیت، قسەکانت برازێنەوە.

***شابانۆ ئەلیزابت***: قسەی دروست و هەق رازانەوەی ناوێ

***ریچارد شا*** : کەواتە رێك و رەوان، چیرۆکی ڤیانی منی بۆ باس بکە.

***شابانۆ ئەلیزابت***: ئاخر گوتنی نا دروست و نە هەق ، بە شێوەیەکی رێك و رەوان، کارێکی دژوارە ، رەقە.

***ریچارد شا*** : بیانووەکانت لە رادەبەردە سەرڤەسەرڤەو پەلە ئامێزن.

***شابانۆ ئەلیزابت***: نەخێر، بەڵکو زۆر قووڵ و گەلێك مەنگن، وەکو گۆڕی جووتە کوڕە خێر لەخۆ نەدیوەکەم قووڵ و مەنگن!

***ریچارد شا*** : لە دوای چووان مەچۆ خانمەکەم، ئەم قەوانە لێ مەدەوە، چونکە بەسەر چووە!

***شابانۆ ئەلیزابت***: بەڵکو هێندەی لە دوو دەچم تا بەندی دڵم دەپچڕێ.

***ریچارد شا*** : ئێستا بەسەنت جۆرجی موبارەك، بەمیداڵ و لەقەبی سوار چاکیم، بە تاجەکەم...

***شابانۆ ئەلیزابت***: کە بێ حورمەتیت بە یەکەمیان کردووە، دووەمیانت شەرمەزار کردووەو سێیەمیانت داگیر کردوە.

***ریچارد شا*** : سوێند دەخۆم.

***شابانۆ ئەلیزابت***: هیچ سوێندێك مەخۆ، چونکە ئەمە سوێند نییە! سەبارەت بە سەنت جۆرج بێ حورمەتی پێکراوەو موبارەکی و قەداسەتی خۆی لە دەست داوە. میداڵ و شەرەفی سوارچاکی و سەڵەحشوری ،لەکەدار و شەرمەزارت کردووەو خەسێتی بێگەردی سوار چاکی لە دەست داوە، تاجەکەش زەوتکراوەو شکۆی پاشاهانەی ریسوا بووە، گەر دەتەوێ باوەڕت پێ بکەین، سوێند بەشتێ بخۆ کە تۆ زڵمت لێ نەکردبێ.

***ریچارد شا*** : کەواتە سوێند بە خۆم دەخۆم.

***شابانۆ ئەلیزابت***: زوڵمت لە خۆتیش کردووە.

***ریچارد شا*** : کەواتە سوێند بە جیهان دەخۆم.

***شابانۆ ئەلیزابت***: ئەو جیهانەی کەپڕە لەزوڵم و تاوانانی تۆ!

***ریچارد شا*** : بە مەرگی بابم

***شابانۆ ئەلیزابت***: ژیانی تۆ، ریسوای کردووە، لەکەی شەرمەزارییە بە بەسەر مەرگی ئەوەوە.

***ریچارد شا*** : کەواتە سوێند بە یەزدان دەخۆم.

***شابانۆ ئەلیزابت***: ئەو زوڵمەی لە خودات کردووە، لە هەموو زوڵم و تاوانەکانی دیکەت گەورەترە، ئەگەر باکت بە سوێندبا، ئەگەر پابەندی ئەو سوێندەبای کە لە بەردەم خودا خواردت، هەرگیز ئەو یەکێتییەی براکەت، پاشا دیمەزراند، هەڵنەدەوەشایەوەو برایەکەی مینش نەدەکوژرا، ئەگەر باکت بە سوێندبا، پابەندی ئەو سوێندەبای کە لە بەردەم یەزدان خواردت، ئەو تاجەی کە بەسەر سەری تۆوەیە، هەنووکە سەرو لاجانگی کوڕە باڕەکانی منی دەڕازاندەوە، ئەگەر درۆت نەکردبا، هەنووکە هەر دووك شازادە نە لە ژێر گلاّ دەبوون و نە دەبوونە خۆراك و چەشەی کرمان، بەڵکو بۆ خۆ لێرە دەژیان. دەی پێم بڵێ ئێستا دەتوانی بە چ شتێك سوێند بخۆی؟

***ریچارد شا*** : بە ئایندە.

***شابانۆ ئەلیزابت***: رابردووت جوانە! ئەو زوڵم و تاوانانەی لە رابردوودا کردونت، خۆی لە خۆیدا زوڵم و تاوانە دەرهەق بە ئایندە، من لە ئایندەشدا هەر دەگریم، بۆ ئەو زوڵم و تاوانانە دەگریم کە لە رابردووا کردونت. ئەو کوڕانەی تۆ بابت کوشتوون هێشتا لە ژیاندان، لە پیریاندا بۆ لاوێتی بە فیرۆچووی خۆیان دەگرین. ئەو باوکانەی تۆ کوڕەکانت کوشتوون، هێشتا لە ژیاندان، وەکو رووەکی پیری سیس و ژاکاو دەژین، بە دەم پیریی خۆیانەوە بۆ کوژرانی کوڕەکانیان دەگرین.

کەواتە سوێند بە ئایندە مەخۆ، چونکە پێشوەختە، بەر لەوەی زەرەیەك چاکەت دەرهەق کردبێ، زوڵم و تاوانت دەرهەق کردووە، ئەو زوڵم و تاوانەی لە رابردوودا کردووتە، خۆی لە خۆیدا زوڵم و تاوانە دەرهەق بە ئایندە.

***ریچارد شا*** : خودایە هێندەی من بە دڵ و راستگۆیانە نیازی تۆبەم هەیە، بە هەمان ئەندازە لەم جەنگە خەتەرەدا بەسەر دژمنانم زاڵ بکە. دەیسا نەفرەتم لێ بێ، دیسان نەحلەتم لی بێ، خوداو بەخت و یەغباڵ ، نەگبەتی و کوێرەوەریم بێنێتە رێ، رۆژ روناکی خۆی و، شەو ئارامی خۆیم لێ حەرام بکات، ئەستێرەی بەختەوەری، دژی هەر کارێکم بوەستێ، ئەگەر خۆشەویستی دڵم بەکیژەکەت، شازادە خانمی جوان نەبەخشم، ئەگەر دڵسۆزی راستەقینە، و ڤیانی بێ ریای پێ نەبەخشم! چونکە ئەو کۆڵەکەی بەختەوەری من و تۆیە، بەبێ ئەو، ئەم سەر زەمینە، من و تۆ و ئەو و گەلێك لە مەسیحیانی خواناس دووچاری مەرگ، ترس، وێرانی و نابوودی و لە ناوچوون دەبین، ئەم زەماوەندو تێکەڵبوونە نەبێ لەو هەموو کارەساتە ناخەلەسین، تەنیا بەو کارە رزگار دەبین، جا بۆیە تۆ دایکی ئازیز، هەڵبەتە دەبێ بەدایکی ئازیز بانگت بکەم، ببە بە وەکیلی ڤیانی من، ئەوەی بۆ باس بکە کە چون دەبم، نەك چۆن بووم، لە ئایندەدا دەبم بەچتۆ پیاوێك، نەك ئەو پیاوەی کە ئێستا هەم، تێی بگەیەنە کە لە چ تەنگژەو ئاستەنگێکداین، حاڵی بکە کە ئەم زەماوەندە چەند پێویستە، جڵەو بۆ سۆزی منداڵانە و گەوجانەی خۆت شل مەکە کە بەسەر کارە گەورەکاندا زاڵ بێ.

***شابانۆ ئەلیزابت***: یانی بەو جۆرە خۆم بە وەسوەسەو دنەدانی شەیتان بسپێرم؟

***ریچاد شا*** : بەڵێ، ئەگەر شەیتان بۆ کاری خێر هانت بدات.

***شابانۆ ئەلیزابت***: یانی خودی خۆم لەبیر بکەم تاخۆم رازی بکەم؟

***ریچارد شا*** : بەڵێ، ئەگەر یادی خۆ بوون، زوڵم بێ لە خۆت.

***شابانۆ ئەلیزابت***: بەڵام تۆ جووتێ کوڕت کوشتووم.

***ریچارد شا*** : بەڵام لە منداڵدانی کیژەکەتا دەیانێژم، تا لەو هێلانە تورکیەوە[*] ، سەر هەڵدەنەوەو خەڵکانێك بخەنەوە کە ببنە مایەی شادییەکی تازە بۆ تۆ.

***شابانۆ ئەلیزابت***: یانی بچم کیژەکەمت بۆ رازی بکەم؟

***ریچارد شا*** : تا بەم کارە ببی بە دایکێکی بەختەوەر.

***شابانۆ ئەلیزابت***: من دەڕۆم. بە پەلە نامەم بۆ بنووسە تا وەڵامی کیژەکەمت لێ بگێڕمەوە.

***ریچارد شا*** : ماچی ڤیانی راستەقینەی من بە کیژەکەت بگەیەنە *(ماچی دەکات)* بە هیوای دیدار *(شابانۆ ئەلیزابت وەدردەکەوێ)*. ئەی گەوجی دڵنەرمی خۆشباوەڕ ئەی ژنی ساویلکە و راڕاو وازوازی!

***(راتکلیف وەژوور دەکەوێ و کاتسبی بە دوویا)***

---

[*] هێلانەی تورکی: شەکسپیر لێرەدا ئاماژە بۆ ئەو هێلانە ئەفسانە ییە باوەی وڵاتانی عەرەب دەکات، کە سیمرغ خۆی تیا سووتا ندووەو سیمرغێکی دیکە لە دایك بووە.

***راتكليف***: پاشام، هێزێكی دەریایی گەورەو بەهێز، لە كەناری ڕۆژاوا جێگیر بووە، گەلێك لە دۆستانی ڕاڕاو دوو دڵ و ترسنۆكمان بەبێ چەك لەوێندەر، لە كەنارەكەدا خڕ بوونەتەوەو زات و نیازی بەرەنگاریی ئەو هێزەیان نیە. دەڵێن، "ڕیچموند" دەریا سالاری ئەو هێزەیە گوایە بایەوانیان داداوەتەوەو چاوەڕوانی "بكینگهام"ن كە بە خۆو هێزەكەیەوە بچێتە كۆمەكیان و لە دابەزینا پێشوازیان بكات.

***ریچارد شا***: با یەكێك لە دۆستانمان بەلەز بڕوات بۆ لای دۆك نورفوك، راتكلیف خۆت بڕۆ، یا كاتسبی بنێرە، كوا ئەوە لە كوێیە؟

***كاتسبی***: ئەوەتام ئەزبەنی.

***ریچارد شا***: كاتسبی، هەر بە فڕین بفڕە بۆ لای دوك.

***كاتسبی***: دوو پێم هەن، دوانی دیكەش قەرز دەكەم.

ریچارد شا: ***(بە راتكلیف)*** تۆش بەلەز بڕۆ بۆ سالسبوری. هەر كە گەییشتیە ئەوێندەر ... ***(بە كاتسبی)*** هەی خوێری گەمژەی گەوج، بۆ رەق راوستاوی، ئەدی بۆ ناچی بۆ لای دۆك؟

***كاتسبی***: گەورەم جارێ پێم بڵێ راسپاردەو ئەمری جەنابت چیە، لە زاری خاوەن شكۆتانەوە چی بە دۆك بڵێم؟

***ریچارد شا***: راست دەكەی كاتسبی ئازیز، پێی بڵێ هەر ئێستا، تا دەتوانێ هێزێكی گەورە خڕ بكاتەوەو بەپەلە بێ بۆ سالسبۆری و لەوێندەر بمدینێ.

***كاتسبی***: من دەڕۆم ***(وەدەردەكەوێ)***

***راتكلیف***: جەنابت دەتەوێ لە سالسبوری چ بكەم؟

***ریچارد شا***: باشە، بەر لەوەی من بۆ ئەوێندەر بڕۆم، تۆ چت پێدەكرێ؟

***راتكلیف***: ئەزبەنی، بەخۆت ئەمرت فەرموو بەر لە ئێوە بۆ ئەوێندەر بچم.

***ریچارد شا***: بیرم گۆڕی ئاغا، بیرم گۆڕی ***(لۆرد ستانلی وەژوور دەكەوێ)***. ها، خەبەرو باس؟

***ستانلی***: ئەزبەنی، هەواڵێكی وام پێ نییە كە شادت بكات، بەڵام زۆریش خراپ نییە، چاریش نییە دەبێ بیڵێم.

***ریچارد شا***: مەتەڵێكی سەیرە! نە باشە، و نەخراپ! ئەم پێچە بە دەورەیە چییە؟ راست و رەوان بیڵێ و تەواو دەی بزانم چ خەبەرو باسێكت پێیە؟

***ستانلی***: ریچموند، لە دەریا دایەو..

***ریچارد شا***: دەریا بە سەریا بڕوخێ و غەرقی بكات، ئەم فیرارە ترسنۆكە چ دەكا لەوێ؟

***ستانلی***: گەورەم نازانم، مەگەر بە مەزەندە..

***ریچارد شا***: بڵێ بزانم مەزەندەتان چیە، مەزەندەتان چییە؟

***ستانلی***: بە مەزەندە، دورست، بكینگهام، و مورتون هانیان داوە بێ بۆ ئینگلتەراو داوای تەخت و تاج بكات.

***ریچارد شا***: بۆ شاری بێ حاكمە! چما تەختی سەڵتەنت چۆڵە؟ چما شمشێری پاشایەتی لە كێلان نراوە؟ چما پاشا مردووە؟ چما شیرازەی دەوڵەت پچڕاوە؟ باشە جگە لەم كێ لە میراتگران

و هەقدارانی یۆرك ماوە؟ جگە لە میراتگری یورکی مەزن کێ پاشای ئینگلتەرایە؟ باشە پێم نالێی لە دەریادا چ دەکا؟

***ستانلی***: ئەزبەنی، جگە لەو مەزەندەیە ئەقڵم بە هیچ شتێکی دیدا ناشکێ.

***ریچارد شا*** : ئەقڵت هیچ نابڕێ تەنیا ئەوە نەبێ کە ئەم (ویلزی)یە هاتووە تا ببێ بە سەروەرو پاشات؟ دەترسم کێچ بکەوێتە کەوڵت، یاخی بی و بۆ لای ئەو هەڵێی.

***ستانلی***: نەخێر سەروەری گەورەم، زەنی خراپم لێ مەکە.

***ریچارد شا*** : ئەدی کوا لەشکرەکەت تا بەرەنگاریان ببیتەوە و پاشەکشەیان پێ بکەی؟ کوا بەکرێگیراو و پیاوەکانت لە کوێن؟ ئایا ئێستا لە کەناری رۆژاوا نین تا ئاژاوە گێڕەکان بەسەلامەتی لە کەشتییەکانیان دابەزێنن؟

***ستانلی***: نەخێر پایەبەرز، دۆستەکانم لە باکورن.

***ریچارد شا*** : دۆستە ساردو سڕەکانت دەرهەق بە ریچاردا! ئەوانە لە کاتێکا دەبوایە لە رۆژاوادا خزمەتی پاشای خۆ بکەن. لە باکوور چ دەکەن؟

***ستانلی***: گەورەم خاوەنشکۆ، ئەو ئەمرەیان پێنەکراوە، ئیجازەم بدەیە، تا دۆست و یاوەرەکانم خڕ بکەمەوە، و لە هەر شوێن و زەمانێکا پێتان خۆشە بگەمە خزمەتی خاوەنشکۆتان.

***ریچارد شا*** : بەڵێ، بەڵێ، تا بچی بۆ لای ریچموند و پەیوەندی بەوەوە بکەی، نەخێر جەناب، من باوەڕ بە تۆ ناکەم.

***ستانلی***: پاشای هەرە مەزنی من، هەق نیە گومان لە دڵسۆزی و وەفاداری من بکەی، من هەرگیز خیانەتم لە ئێوە نەکردووەو هەرگیزیش نایکەم.

***ریچارد شا*** : باشە، بڕۆ زەلامان کۆ بکەوە، بەڵام دەبێ کوڕەکەت، جۆرج ستانلی، بە بارمتە لێرە بەجێ بێڵی، ئەگەر بە ئاستەم دڵ بگۆڕی و پێ خوار دابنەی سەری کوڕەکەت تیا دەچێت.

***ستانلی***: باشە بە گوێرەی ئەمەکداری من بۆ ئێوە رەفتاری دەگەڵ بکەن. ***(وەدەردەکەوێ.)***

***(پەیکێك وەژوور دەکەوێ)***

***پەیك***: گەورەم، خاوەنشکۆ، وەکو هەندێ لە دۆستان پێیان راگەیاندووم کە سێر ئیدوارد "کورتنی" و برا گەورەکەی ئوسقوف (ئیکستر)ی سەرکێش، لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە هاوپەیمانانیاندا هێزێکیان لە (دیفون شایر) دا کۆکردووتەوە. ***(پەیکێکی دی وەژوور دەکەوێ).***

***پەیکی دووەم:*** ئەزبەنی بنەماڵەی "گیلفورد"ەکان لە "کنت"دا لەشکریان خڕ کردووەتەوەو سەعات بە سەعات هەواداران و هاوکارانی زیاتر دەدەنە پاڵیان و هێزەکەیان سات بە سات زۆر ترو زیاتر دەبێ،

***(پەیکی سێیەم وەژوور دەکەوێ)***

***پەیکی سێیەم***: گەورەم، لەشکری دوك بکینگهام....

***ریچارد شا*** : لا کەون لەبەر چاوم ئەی قەلە رەشینە! هیچ شتێ نەماوە تەنیا ئاوازی مەرگ نەبێ؟ ***(شەپەلاغێکی پێدا دەکێشێت)*** بگرە دەی، بڕۆ تا هەواڵی خۆشم بۆ نەیەنی، نەیەیتەوە.

***پەیکی سێیەم***: قوربان ئەو هەواڵەی دەمویست عەرزی خاوەنشکۆتانی بکەم، ئەمەیە کە سێڵاوو لافاو و بارانی کوتوپڕ لەشکرەکەی بکینگهامی تەفرو تونا کردووە، بە خۆیشی سەری هەڵگرتووە، کەس نازانێ رووی لە کوێ کردووە.

***ریچارد شا*** : لێم ببوورە! ها ئەو کیسەیە بگرە، با دڵت بێتەوە جێ، باشە هیچ دۆستێکی ئاقڵمان جاڕی خەڵاتی داوە بۆ ئەو کەسەی ئەو خاینە بگرێ و بێنێ؟

***پەیکی سێیەم***: بەڵێ گەورەم، خەڵات دیاری کراوە، ***(پەیکی چوارەم وەژوور دەکەوێ).***

***پەیکی چوارەم***: گەورەم، دەڵێن سێرتۆماس لوڤڵو لۆرد مارکیز دورست لە یورکشایر هێزیان خڕ کردۆتەوە، بەڵام هەواڵێکیشم پێیە کە بە دڵی جەنابتان دەبێ، دەڵێن نێروی دەریایی بەریتانی بەر تۆف و بۆران کەوتووەو شپرزەو پەراگەندە بووە. ریچموند بەلەمێکی بۆ کەناری "دورستشایر" ناردووە تا بزانێ ئەوانەی لە کەنارەکەدا خڕ بوونەتەوە بۆ کۆمەك و هاوکاری ئەو هاتوون یا نا، وایان وەڵام داوەتەوە کە لەگەڵ لەشکرەکەی بکینگهامدا بۆ یارمەتی ئەو هاتوون. بەڵام ریچموند باوەڕی پێنەکردوون، بایەوانی هەڵداوەو بەرەو بریتانی گەڕاوەتەوە.

***ریچارد شا*** : هەڕنەپێش، هەڕنەپێش، مادامێکی ئێمە خۆمان بۆ شەڕ تەیار کردووە، ئیدی شەڕ هەر شەڕە، با لەگەڵ دژمنی دەرەکیش دا نەبێ، چ قەیدییە بەلای کەمەوە ئەو ئاژاوەگێڕو یاخیانەی ناوخۆ تەمبێ و سەرکوت دەکەین، ***(کاتسبی وەژوور دەکەوێ).***

***کاتسبی***: ئەزبەنی، دوك بکینگهام دەستگیرکراوە، ئەمە خۆشترین خەبەری لای منە، بەڵام هەواڵێکی هەندێ ناخۆشیشیم پێیە، کە دەبێ بگوترێ، ئێرل ریچموند بە هێزێکی گەورەوە لە (میلفۆرد) دابەزیوە.

***ریچارد شا*** : کەواتە بەرەو سالسبوری پێشڕەوی بکەن! لەوەیە لە کاتێکا ئێمە لێرە خەریکی قسان بین، لەوێندەر شەڕێکی چارەنووسساز هەڵگیرسێت. با یەکێکتان بکینگهام بۆ سالسبوری بەرێ، و ئەوانی دیتان بەگەڵ من بکەون، ***(دەنگی شەیپوران بەرز دەبێتەوە. وەدەر دەکەون).***

## دیمەنی پێنجەم

## ماڵی لۆرد ستانلی

( **لۆرد ستانلی و سێر کریستۆفر ئارسویکی قەشە وەژوور دەکەون** ).

***ستانلی***: سێرکریستۆفر لە زمانی منەوە بە ریچموند بڵێ کە جۆرج ستانلی کوڕم، لە تەویڵەی ئەو یەکانە خوێنرێژەدا زندانی کراوە، ئەگەر من یاخی بونی خۆم رابگەیەنم لە ملی جۆرج دەدەن، جا لەبەر ئەمە ناتوانم ئێستا بە هەموو تواناوە و وەکو پێویست یارمەتی بدەم، تۆ بڕۆ، و سلاوی من بگەیەنە جەنابیان، پێی بڵێ شابانۆ لە دڵەوە قاییل بووە کیژەکەی لە پاشا مارە کات. باشە پێم ناڵێی میر ریچموند لە کوێیە؟

***کریستوفر***: لە "بمبرۆك"، یا (هارڤۆردویست)ی وێڵزە.

***ستانلی***: باشە لە ناوداران کێی لەگەڵە؟

***کریستۆفر***: (سێر ولتر هربرت) کە جەنگاوەرێکی رەشیدە، (سیر گیلبرت تالبوت)، (سێر ولیام ستانلی)، (ئیرل ئۆکسفورد) و (ئیرل بمبرۆك)ی دژمن تۆقێن، و (سیر جیمز بلانت) و (رایس ئاب توماس) لەگەڵ کۆمەڵێك جەنگاوەرانی ئازاو ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکانی بەناوبانگ و بەقەدری دیکەدا، ئێستا بەرێوەن بەرەو لەندەن، ئەگەر لە رێگەدا تووشی شەڕ نەبن.

***ستانلی***: دەیسا بگەڕێوە بۆ لای سەروەرت و سلاوی منی پێ بگەیەنە، بەم پەیامەدا رای منی بۆ دەردەکەوێ، بە هیوای دیدار (وەدەردەکەون).

## فەسڵی پێنجەم

### دیمەنی یەکەم

### سالسبوری – مەیدانێکی گەورە و کراوە

( **فەرماندەی پۆلیس لەگەڵ بکینگهام و چەند نێزە بە دەستێك وەژوور دەکەون، بکینگهام بەرەو ئیعدام دەبرێ** ).

***بکینگهام***: باشە ریچارد شا قاییل نیە قسەی لەگەڵ بکەم؟

***فەرماندە***: نەخێر، جەنابی لۆردی هێژا، بۆ خۆت ئارام بگرە.

***بکینگهام***: ئەی هیستینگز، ئەی کوڕانی ئیدوارد، ئەی ریڤەرزو ئەی گرای، ئەی شا هنری موبارەك، ئەی ئیدوارد، ئەی کوڕە جوانەکەی هنری! ئەی ڤوگان، ئەی هەموو ئەوانەی بوونە قوربانی بێدادی پەنهانی و دەسیسە و پیلانی نامەردانە، ئەگەر روحی تورەو نیگەرانتان، لە پشتی هەورانەوە تەمەشای من و ئەم ساتەی ئێستای من دەکەن، ئەگەر بۆ تۆڵەش بووە، گاڵتە بە کوشتن و لە نێوچوونی من بکەن! ئەرێ هاوڕێ ئەمڕۆ رۆژی روحان، رۆژی یادکردنەوەی روحان نییە؟

***فەرماندە***: بەڵێ ئەزبەنی، وایە.

***بکینگهام***: کەواتە ئەمڕۆ، رۆژی نەمانی منە، ئەمە ئەو رۆژەیە کە لە بەردەم شا ئیدواردا، لە خودا پاڕامەوە کە ئەگەر خیانەتم لە منداڵەکانی یان لایەنگران و دەستەوبەستەی ژنەکەی کرد، خودا بمگرێ. ئەو رۆژەیە کە لەیەزدان پاڕامەوە گەر خیانەتم لەو کەسە کرد کە لە هەموو کەس پتر باوەڕو متمانەی پێم هەیە، خودا بمکوژێ و گیانم بسەنێ، ئەمڕۆ ***" رۆژی هەموو روحەکانە"*** ئەو رۆژەیە کە هەموو تاوانەکانمی تێدا تەواو دەبێ. خواوەندی مەزن و ئاگا بە هەموو شتێ، دوعا درۆینەکانمی دایەوە بەسەر خۆماو تۆڵەی ئەو درۆیانەی لێکردمەوە، دوعا درۆینەکانمی لە خۆم گیرا کرد.من بە شۆخی و سوعبەتەوە لەبەری پاڕامەوە ئەو بە جدی دوعاکەی گیرا کردم، بەو جۆرە شەڕخوازان ناچار دەکات نووکی شمشێرەکانیان بکەنە سینگی خۆیان، ئەوا تووك و نەفرەتە قورسەکانی مارگرێتم لێ گیرا بوو کە دەیگوت: ***" رۆژێ دێ دڵت لە خەم و کەسەراندا شەق دەبات، هەنگێ بیرت دەکەوێتەوە و دەڵێی مارگرێت راستی کرد، مارگرێت پێغەمبەر بووە"*** دەی ئاغایان بەرەو قەنارەی نەنگینی کوشتنم بەرن، زوڵم هەر زوڵمی لێدەکەوێتەوە، تۆڵەی کوشتن هەر کوشتنە.

## دیمەنی دووەم

## سەربازگەیەکی نزیکی تامورت – Tameorth

**( ریچموند و ئوکسفورد و هربرت و پلانت وکۆمەڵێکی دی بە دۆڵ و بەیداخەوە وەژوور دەکەون )**

***ریچموند***: هاوڕێیانی جەنگ و تەنگانە، ئەی دۆستانی هەرە ئەمەکدار و بە وەفام، ئێمە کە زامداری نیرو تەوقی زوڵم و زۆرین، ئەمێستا بێ هیچ لەمپەرو کۆسپان، گەیبوینەتە ناو جەرگەی وڵات، نامەیەکی ستانلی باوەپیارەم بۆ هاتووە، زۆر دڵخۆشکەرەو مژدە بەخش و هاندەرە، ئەو بەرازە کێویە خوێنرێژو داگیرکەرە، کە کێڵگەو مەزرا هاوینەکانی بە تاڵان بردون و رەزو باخانی پڕ بەری وێران کردوون، و خوێنی گەرمی رشتوون وەکو ئەوەی ئاو بێ و دەستانی خۆی پێ بشوات،بەڵێ ئەو بەرازەی کە سینەی تینووی ئێوەی کردووە بە حەوزو کانیاوی خۆی، ئەو بەرازە چەپەڵە وەکو هەواڵمان زانیوە، لە ناو جەرگەی ئەم دوڕگەیەدایە، لە نزیکی شاری "لیستر" هەڵیداوە جا ماوەی نێوان "تارموت" و ئەو شارە تەنیا یەك رۆژە رێیە. کەواتە هاوڕێ و دۆستانی دلاوەر، پشت بە خوای مەزن بکەونە رێ، تا بە مەینەتی و کارەساتی، یەك شەڕی خوێناوی، بەری ئاشتی هەمیشەیی بچنینەوە.

***ئۆکسفورد***: خەمت نەبێ، ویژدانی هەر کەسێکمان دەبێ بە هەزار شمشێرو شەڕی ئەو پیاوکوژە خوێنخۆرە دەکات!

***هربرت***: من دڵنیام هەوادارو لایەنگرەکانی لێی هەڵدەگەڕێنەوەو پەیوەندی بە ئێمەوە دەکەن.

***بلانت***: ئەو کابرایە هیچ دۆستێکی نیە، تەنیا ئەوانە نەبێ کە لە ترسا دۆستایەتی دەکەن، ئەوانەش لە تەنگانەترین کاتیا بەجێی دێڵن.

***ریچموند***: هەموو ئەم شتانە لە قازانجی ئێمەدان، ناوی خودای لێ بێنن و هەڕنەپێش! هێڤی و ئومێدی راستەقینە باڵی گرتووەو بە جووتێ باڵی تیژەوە دەفڕێ، پاشایان دەگەیەنێتە پایەی خواوەندان و عەوام دەگەیەنێتە پایەی پاشایی.

*(وەدەر دەکەون).*

## دیمەنی سێیەم

## بەرەی بوسورت - Bosworth

**(ریچارد شا بە تەدارەکی جەنگەوە لەگەڵ نورفوك و ئیرل سوری و هەندێکی دیدا وەژوور دەکەوێ. )**

***ریچارد شا*** : لێرەدا، لەم مەیدانی "بوسورت"ەدا خێوەتەکانمان هەڵدەن، سوری بۆچی وا خەمبار دیاری؟

***سوری:*** شادی بە دڵە، نەك بە سیما، دڵم زۆر لە سیمام شادترە!

***ریچارد شا*** : ها جەنابی نورفوك!

***نورفوك:*** ئەمرکە، خاوەنشکۆ!

***ریچارد شا*** : نورفوك، هەڵبەتە دەبێ زەربەیەك بوەشێنین، وا نیە؟

***نورفوك:*** سەروەری پڕ لوتفم، دەبێ هەم بیوەشێنین و هەم وەری بگرین.

***ریچارد شا*** : خێوەتەکەی منیش لێرە هەڵدەن! ئەمشەو لێرە بەسەر دەبەم، بەڵام سبەی لە کوێ؟ فەرق ناکا، بە هەر حاڵ با واز لەمە بێنین، کەستان ژمارەی خاینانتان شناسایی کردووە؟

***نورفوك:*** ئەوپەڕی شەش یا حەوت هەزار کەسێك دەبن،

***ریچارد شا*** : تۆیف، قۆشەنەکەی ئێمە سێ هێندەی هی ئەوانە، ئەمە جگە لەوەی ناوی پاشا خۆی لە خۆیدا، قەڵایەکی قایمە دژمن ئەمەی نیە. خێوەتەکەم لێرەدا هەڵدەن، دەی شێرە پیاوان با دیراسەیەکی مەیدانی جەنگەکە بکەین و سەحی بکەینەوە. دەی چەند پیاوێکی ئەزموونەدار بانگ بکەن، با نیزام و سورعەت رابەرمان بێ، چونکە هێژایان سبەینێ وەکو رۆژی حەشر دەبێ.

***(لە قوڵەکەی تری مەیدانەکەوە، ریچموند، سێر ویلیام براندون و ئوکسفورد، کۆمەڵێکی دی وەژوور دەکەون، چەند سەربازێك خێوەتەکەی ریچموند هەڵدەدەن).***

***ریچموند:*** ئەوا هەتاوی ماندوو لە ئاسۆی زێڕینا ئاوا بوو، رێچکەی پرشنگداری عارەبانە ئاگرینەکەی دوایی خۆی، نیشانەی ئەوەیە کە سبەینێ رۆژێکی خۆش دەبێ. ئەی سێر ولیام براندون تۆ دەبی بە عەلەمداری من و عەلەمەکەی من هەڵدەگریت. هەندێ میداد و کاغەزم بۆ بێنن بۆ خێوەتەکەم تا نەخشەو شێوەی شەڕەکە بکێشم، و کارو فەرمانی هەر فەرماندەیەك دیاری بکەم، تا لەشکرە بچووکەکەمان بە شێوەیەکی گونجاو دابەش بکەم، بەڵام تۆ جەنابی لۆرد ئۆکسفورد، تۆش سێر ولیام براندون، هەروەها تۆش سێر وەلیتر هربرت، لەگەڵ مندا بمێننەوە. با ئیرل پیمبرۆك (Pembroke) لەگەڵ یەکەکەی خۆیدا وەمێنێ. با کابتن "بلانت"ی نەجیب سڵاوی منی پێ بگەیەنێ و ئاگاداری بکاتەوە کە سەعات دووی بەرەبەیان بێ بۆ خێوەتەکەم و یەکتر بدینین. بەڵام بلانتی ئازیز بەر لەوەی بڕۆی، با شتێکی دیکەشت لێ بپرسم، دەزانی لۆرد ستانلی لە کوێ هەڵیداوە؟

***بلانت:*** قوەتەکەی ئەو، ئەگەر بەیاخەکانی ئەوم لێ نەگۆڕابێ، کە باوەڕ ناکەم لێم گۆڕابێ، لە نیو میلی باشووری هێزە گەورەکەی پاشادا هەڵیداوە.

***ریچموند:*** ئەگەر دەتوانی، بەبێ ئەوەی خۆ بخەیە تالوکەوە، بلانتی ئازیز سڵاوی منی پێ بگەیەنەو ئەم پەیام وتۆمارە گرینگ و پێویستەی منی بۆ ببە.

***بلانت:*** بەگیانی خۆم ئەم کارەت بۆ دەکەم گەورەم، جارێ شەوباش!

***ریچموند:*** شەوت باش کاپتن بلانتی ئازیزم، دەی بەڕێزینە وەرن با تەگبیری سبەینێ بکەین. وەرنە خێوەتەکەی منەوە، دنیا ساردو شێدارە، ***(دەچنە خێوەتەکەوە).***

***(ریچارد شا، نورفوك، راتکلیف و کاتسبی و ئەوانی دی وەژوور دەکەون).***

***ریچارد شا:*** سەعات چەندە؟

***کاتسبی:*** ئەزبەنی کاتی شیوە، سەعات نۆیە.

***ریچارد شا:*** ئەمشەو شیو ناخۆم، هەندێ میداد و کاغەزم بۆ بێنن، بەڕاست کڵاو خودەکەتان بۆ چاك کردم، چەك و ئەسڵەحەکەتان بۆ بردمە خێوەتەکەی خۆم؟

***کاتسبی:*** بەڵێ گەورەم، هەمووومان لە چادرەکەتا داناوە، هەموو شتێك حازرو ئامادەیە.

***ریچارد شا:*** نورفۆکی ئازیز، بڕۆ بەلای کاری خۆتەوە، ئاگاداری حەرەسیات بە، نیگابانانی باوەڕپێکراو دابنە.

***نورفوك:*** بەڵێ ئەزبەنی، هەر ئێستا دەڕۆم

***ریچارد شا:*** سبەینێ لەگەڵ باڵنداندا رابە نورفۆکی ئازیز.

***نورفوك:*** دڵنیابە گەورەم، خەمت نەبێ ئەزبەنی.

***ریچارد شا:*** کاتسبی!

***کاتسبی:*** بەڵێ ئەزبەنی!

***ریچارد شا:*** پەیکێکی چەکداری فەرمی بنێرە بۆ لای ستانلی و دەستووری پێ بدە کە سبەینێ لەگەڵ گەردی بەیانیدا بە خۆو هێزەکەیەوە پێشڕەوی بکات، دەنا سەری جۆرجی کوڕی دەکەوێتە شکەفتی تاریکی شەوی هەمیشەییەوە ***(کاتسبی وەدەردەکەوێ)***، پەرداخێ بادەم بۆ پڕ بکە، مۆمێکم بۆ بێنە، مۆمێکی کاتژمێرم* بۆ بێنە، ئەسپە سپییەکەشم (سڕی) بۆ زین بکە با بۆ شەڕی سبەینێ ئامادە بێ. چەند رمێکی باشم بۆ ئامادە بکە بەڵام با زۆر قورس نەبن، راتکلیف!

***راتکلیف:*** قوربان!

***ریچارد شا:*** ئەرێ لورد نورتمبرلاندی** خەمگینت بینی؟

***راتکلیف:*** لای بولێڵی ئێوارێ لەگەڵ ئیرل سوری دا بەسەر یەکە سوپاییەکاندا دەسوڕایەوەو سەربازەکانی هاندەدا و جۆشی دەدان.

---

* مۆمی کات ژمێر: مۆمێك بووە بە سەر چەند بەشێکدا دابەشکراوەو هەر بەشەی لە کا تێکی د یا ریکراودا سووتاوە.

** چونکە بە دڵ لەگەڵ ریچار شادا نەبوو، ریچا رد نا وی نا بوو نورتمبرلاندی خەمگین.

***ریچارد شا*** : ئەمەم بەدڵە، جامێ بادەم بدەیە، ئەمڕۆ بە پێچەوانەی جارانەوە، پەست و خەمگینم، داینە، قەڵەم و کاغەزت ئامادە کرد؟

***راتکلیف***: بەڵێ ئەزبەنی.

***ریچارد شا*** : بە نیگابانەکانم بڵێ ئاگاداری نیگابانی بن، ئێستا ئێوە بڕۆن، راتکلیف، لای نیوەشەو وەرەوە بۆ ئێرە تا یارمەتیم بدەی کە زرێ و چەك و ئەسڵەحەکەم بپۆشم. پێم گوتن بڕۆن، بە تەنیا بە جێم بێڵن.

***(راتکلیف و ئەوانی دی وەدەردەکەون).***

***

***(داربی خۆی بە خێوەتەکەی ریچموندا دەکات، کە چەند ئەشراف و لوردێك لە خزمەتیا وەستاون).***

***داربی***: بەخت و سەرکەوتن یارو یاوەرت بێ!

***ریچموند:*** بەرەکەت و ئاسودەیی شەوت بەسەردا بباریێ ئەی باوە پیارەی نەجیبمان، حاڵی دایکی خۆشەویستمان چۆنە!

***داربی***: لە جیاتی دایکت کە هەمیشە دوعای خێرت بۆ دەکات، دوعای خێرت بۆ دەکەم، بەلآم با واز لەمە بێنین. لەشکری شەو خەریکە مەیدان بۆ رۆژ چۆڵ دەکات، سەعات بە ئارامی و بە کپی تێ دەپەڕێ و تاریکی وا لە رۆژهەلآتەوە دەڕەوێتەوە، بە کورتیەکەی کات وا دەخوازێ پەلە بکەی و خۆت بۆ شەڕی بەیانی تەیار بکەی و کوشتاری خوێنین و جەنگی کوشندە بکە بەو داوەرەی کە چارەنووست دیاری دەکات، من لە کاتی بە دەسەلآتی و تواناییمدا نەمتوانی هیچ بکەم چ جای ئێستا کە ناتوانم پەل ببزووم؟ بە هەر حاڵ بەپێی توانای خۆم هەوڵدەدەم دەرفەت بێنم و لەو شەڕە ئاکام نادیارەدا یارمەتیت بدەم. حەزم دەکرد بمتوانیایە بە ئاشکرا پشتیوانی خۆمت بۆ بسەلمێنم، بەلآم دەترسم دەستەکەم کەشف بێ، هەنگینێ جۆرجی برات، جۆرجی نۆلاو بە بەرچاوی بابیەوە دەکوژرێ، جارێ خودا حافیز، کەمی وەخت و حەساسیەتی حاڵەکە بواری ئەوە نادەن پیاو سۆز و پەیمانی خۆی دەربڕێت و درێژە بە قسەی خۆش بدات، ئەو قسە خۆشانەی کە دوو دۆستی، لێکدی دوور، لە مێژە لێی دوورن. خودا بە قودرەتی خۆی دەرفەت و دەلیڤەی تەواوی ئەو جۆرە خۆش و بەشەمان بۆ بڕەخسێنێ، جارێکی دی خودا حافیز، ورەت بەرز بێ و چوست و چالاکانە بکەوەخۆ.

***ریچموند***: سەروەرانی ئازیز، بیگەیەننەوە لای قوەتەکەی خۆی، هەوڵ دەدەم، هەر چەند نیگەرانم، کەمێك چاو گەرم بکەم، نەبادا سبەینێ، لە کاتێکا دەبێ سواری باڵی سەرکەوتن بم، خەوێکی قورس سواری سەرم بێ، جارێکی دی سەروەران و ئاغایانی میرەبان شەوتان باش، ***(هەموو وەدەر دەکەون جگە لە ریچموند بە دەم کڕنۆشەوە).*** خودایا ئەی ئەو کەسەی، کە خۆم بە سەردار و گەورەی سەربازەکان دەزانم، بە چاوی پڕ لوتف و مەرحەمەتەوە بڕوانە سەربازەکانم! گورزو شمشێری غەزەبی خۆت بخە دەستیانەوە، تا بە جەزرەبەی قورس، کلاوخودی دژمنە داگیرکەرەکانمان وردو خاش بکەن و پەرتی سەر زەوی بکەن. بمانکە بە نوێنەری تۆڵەی خۆت تا

له سەرکەوتنا سوپاست بکەین، بەر لەوەی خەو باڵ بەسەر چاوانمدا بکێشێت، روحی بێدارم بە تۆ دەسپێرم، لە خەو ولە بێداریمدا تۆی نەمر ئاگادارم بە! *(دەنوێ)*.

***(تارمایی میر ئیدوارد، کوڕی هنری شەشەم لە نێو خێوەتەکاندا دەردەکەوێ).***

***تارمایی***: (بە ریچارد): بۆ کوێ دەچی، سبەینێ چۆك دەخەمە سەر سینگی روحت، لە بیرتە چۆن لە هەڕەتی لاویما، لە توکسبری بەر خەنجەرانت دام. دەیسا خێر نەبینی و بمری! (بە ریچموند) ئەی ریچموند خەمت نەبێ، ورەت بەرز بێ، چونکە روحی کوژراوی میرانی مەزڵوم هاوشان لەگەڵ تۆدا دەجەنگن، من کوڕی هنری پاشام و هاتووم ئاسودەیی و دڵنیاییت بخەمە دڵ و دەروون، (ون دەبێ)، (تارمایی هنری شەشەم دەردەکەوێ).

***تارمایی***: (بە ریچارد) کە لە ژیانا بووم، ئازای ئەندامم بە دەستی تۆ ئەنجن ئەنجن کرا، دەیسا مەرگ و نا ئومێدیت لێ بباری، من هنری شەشەمم و مژدەی نا ئومێدی و مەرگت دەدەمێ. (بە ریچموند) ئەی پیاو چاکی بێگەرد و پاك، خێرو سەرکەوتن بێتە ڕێت، من هاریم، ئەو هارییەی کە پێشبینی کردبوو کە تۆ دەگەیە پاشایەتی، هاتووم لە خەوتا ئاسوودە و دڵنیات بکەم. هەر بژی و سەرکەوتوو بیت!

***(تارمایی کلارنس دەردەکەوێ).***

***تارمایی***: (بە ریچارد)، سبەینێ چۆك دەنە سەر سینگت، روحت دەتاسێنم، من کلارنسی بەلەنگازم، ئەو کلارنسەی کە بە غەدر و خیانەت کوشتت، پاشان لە بادەی گلاوت هەڵکێشا. سبەینێ لە گەرمەی جەنگدا یادم بکەوە، و شمشێرە کولەکەت فڕێ بدە، دەك نا ئومێدی و مەرگت لێ بباری! (بە ریچموند) ئەی رۆڵەو فەرزەنی ماڵبات و خانەدانی لانگستەر، هەموو میراتگرانی مەزڵومی یورك دوعاگۆی تۆن و دوعای خێرت بۆ دەکەن، فریشتەی خێر دەست بە باڵتەوە بگرن! هەر بژی بە شادی و سەرکەوتن.

***(تارمایی و تاپۆی ریڤەرز، گرای و ڤوگان دەردەکەون).***

***تارمایی ریڤەرز***: (بە ریچارد) خۆت بگرە بۆ سبەینێ، بزانە چۆن چۆك دەخەمە سەر روحت و دەیتاسێنم، من ریڤەرزم، ریڤەرز، ئەو ریڤەرزەی کە لە پومفرتدا کوژرا، دەك نائومێدی و مەرگت لێ بباری.

***تارمایی گرای***: (بە ریچارد) گرای وەبیر خۆت بێنەوە، خودایە نا ئومێدی و مەرگت لێ بباری!

***تارمایی ڤوگان***: (بە ریچارد) بیر لە ڤوگان بکەوە، خودا بەگوناهی خۆتت لەگەڵدا بکات، ترسێکی وات لێ بنیشێت دەستت شمشێر نەگرێ، خودایە خێر نەیەتە ڕێت و بەشت هەر نا ئومێدی و مەرگ بێ.

***هەموو تارماییەکان***: (بە ریچموند) هەستە، رابە! چاك بزانە ئەو زوڵمەی ریچارد دەرهەق بە ئێمەی کردووە، رووی خۆی دەگرێتەوە، دەبێ بەمۆتەکەو دەیتاسێنێ، دەیسا رابەو جەنگی خۆت ببەوە، *(تارمایی لۆرد هیستینگز دەردەکەوێ)*

***تارمایی***: (بە ریچارد) ئەی خوێنرێژی تاوانبار، بەدەم باری قورسی تاوانەوە ڕابە، و دوا رۆژانی ژیانت لە جەنگێکی خوێناویدا بەسەر بەرە! لۆرد هیستینگز وەبیر خۆت بێنەوە، خێر نەبینی، نا

ئومێدی و مەرگت لێ بباریٚ. (بە ریچموند) ئەی نەفسی ئاسوودەو ئارام ڕابە، ڕابە، دەست بدە چەك، لە پێناوی ئینگلتەرای ئازیزدا بجەنگە، سەرکەوتن بە دەست بێنە! *(ون دەبێ)، (تارمایی هەردوو میرە نەوجەوانەکە دەردەکەوێ).*

***جووتە تارمایی:*** (بە ریچارد)، با دوو برازا چکۆڵەکەت، ئەوانەی لە بورجدا خەفەکران، بێنە خەونت، دەك خوای ئەوانە بتگرێ، ئەی ریچارد چاك بزانە وەکو بارە قورقوشم دەنیشینە سەر سینگت و لێت نابینەوە، تا لە بەدبەختی و ماڵوێرانی و ریسوایی و مەرگ بارت نەکەین! روحی جووتە برازاکەت هاتوون تا هەواڵی نا ئومێدی و مەرگت بدەنێ، (بە ریچمون) بنوو، بنوو، بنوو، بە ئارامی و ڕابە بە خۆشی و شادی. فریشتەی خێرو فەڕ لە وەزەنی ئەو بەرازە کێویەت بپارێزن! بژی و نەوەیەکی خوڕەم و شادمانی پاشایان بخەوە. کوڕانی بەدبەختی ئیدوارد دوعای سەرکەوتنت بۆ دەکەن. *(ون دەبن)، (تارمایی لەیدی ئان وەدەردەکەوێ).*

***تارمایی:*** (بە ریچارد)، ریچارد، ئەمە ژنەکەتە، ژنە بەدبەخت و کلۆڵەکەت، ئان، ئەو ئانەی کە بۆ تاقە سەعاتێکیش لەگەڵتا نەخەوت و نەحەوایەوە، ئەمێستا هاتووەو خەو لە چاوانت دەتارێنێ، سبەینێ لە مەیدانی جەنگدا یادم بکەوە، تا دەستت شمشێرە کولەکەت نەگرێ، دەك خێر نەبینی و هەر نا ئومێدی و مەرگ بێ بەشت! (بە ریچموند) ئەی روحی ئاسودەو ئارام، بنوو بە دڵنیایی وخۆشی، خەون بە سەرکەوتنەوە بدینە! ژنی دژمنەکەت دوعاگۆی تۆیە، دوعای خێرت بۆ دەکا! *(تارمایی بکینگهام بە دیار دەکەوێ).*

***تارمایی:*** (بەریچارد) من یەکەم کەس بووم کە یارمەتیم دایت تا تاج لەسەر بنەی، دوایەمین کەس بووم کە تامی زوڵم و بێدادی تۆم نۆشت. دەسا خۆت بگرە، سبەینێ لە جەرگەی شەڕا منت بیر بێتەوە، تا لەترسی تاوانەکانی خۆت زراوت بتۆقێ! خەون ببینە، خەون بە تاوانە خوێناوییەکانت، بە مەرگەوە بدینە، ئومێدەوارم سەرەرۆییت سەرت بخوات، تووشی نائومێدیت بکات، و بەوپەڕی نا ئومێدی دوا هەناسە بدەی و گیانت دەرچێت، (بە ریچموند) ئومێدی کۆمەك بە تۆ، بەر لەوەی بتوانم خزمەتێکی تۆ بکەم منی بە کوشت دا، حەیفێ مردم و نەگەییم خزمەتێکی تۆ بکەم. بەڵام تۆ ورە بەرمەدەو هەنگاو بنە. خواو فریشتەی خێرو فەڕ، لە بەرەی ریچموندا دەجەگن، و ریچارد لە لوتکەی شکۆدارییەوە هەڵدەدێرێ *(ون دەبێ).*

*(ریچارد شا، لە پڕ لە خەو بێدار دەبێتەوە).*

***ریچارد شا*** : ئەسپێکی دیکەم بدەنێ! زامەکانم تیمار کەن!

یا حەزرەتی عیسا هاوارە، ئەمە تەنیا خەون بوو، ئاه، ئەی ویژدانی ترسنۆك بۆچی هێندەم عەزاب دەدەی! مۆمەکان گڕی شینیان [*] لێ دەبێتەوە، کات نیوەشەوە، ئارەقەی ساردی ترس نیشتووەتە سەر بەدەنی لەرزۆکم، بەڵام لەکێ دەترسم؟ لە خۆم؟ خۆ لە خۆم زیاتر کەسی دی لێرە نییە. ریچارد، ریچاردە، من ئەوم، ئەو منم، کەسێك لێرەیە کە بە تەمابێ بمکوژێت؟ نەخێر، هەر خۆمم... کەواتە تا زووە با هەڵێم، چی! لە خۆم هەڵێم؟! هەنجەتێکی سەیرە! جا بۆچی... تا

---

[*] گڕی شین، ئەمە لەو سەردەمەدا مانای بوونی روح و تا رما یی لەو شوێنەدا گە یا ندووە.

تۆڵـەی لێنەکەمـەوە؟ خـۆم تۆڵـە لـە خـۆم بسـەنم؟ ئەفسـوس و مـەخابن مـن خـۆم خۆشـدەوێ. لەبەرچـی؟ لەبـەر چاکەیەك کـە خـودم لەگـەڵ خـۆمی کـردووە؟ بـە داخـەو نـە ء! چاکەی لەگـەڵ نەکردووم! هەقە خۆم لەبەر ئەو هەموو تاوانـەی کردوونـی، ببـوغزێنم، نـەفرەت لـە خـۆم بکـەم! مـن کابرایەکی شەڕانی و شەڕاشۆم، بەڵام وێڕای ئەمـەش درۆ دەکـەم و دەڵـێم شـەڕانی نـیم، کـەرپیاو هەر ستایشی خۆت بکە، ئاسمان بدڕێ بە لێفە پینە ناکرێ! ویژدانی مـن، هـەزار زمـانی جیـاوازی هەیە: هەر یەکێکیان چیرۆکێك دەگێڕێتەوە، هەر چیرۆکێکیان بەدکارییـەکم دەگێڕێتـەوە. خیانـەت و پەیمانشکێنیێ،درێوترین خیانەت و پەیمانشکێنی! کوشتن، درێـوترین جـۆرو شـێوەی کوشـتن، کوشتنی هەمە جۆرو بە شێوەی هەمـە جـۆر هـەر هـەموویان بەردەرکـەی دادگـام لێـدەگرن و تێکـڕا هاوار دەکەن: ***"هەی تاوانبار، تاوانبار!"*** تەنیا نائومێدیم بۆ ماوەتەوە، چ کەسـێك خۆشـی نـاوێم، ئەگەر بشمرم کەس فرمێسکێکم بۆ ناڕێژێ، کەس روحمم پێ ناکات! جا بۆچی داخم بۆ بخۆن، لە کاتێکدا من خۆم داخ بۆ خۆم ناخۆم؟ خەونم بینی، لە خەونمدا رۆحی هەموو ئەوانەی بـە دەسـتی من کوژرا بوون، رژانە نێو خێوەتەکەم، هەڕەشەیان لێکردم کە سـبەینێ تۆڵـەی خۆیـان لـە ریچـارد دەسەننەوە. ***(راتکلیف وەژوورە دەکەوێ)***

***راتکلیف***: گەورەم!

ریچارد شا: خودایە! ئەوە کێیە؟

***راتکلیف***: منم ئەزبەنی. کەڵەبابی گوند دوو جاران بانگی بەیانی دا، هاوڕێکانت هـەموو ڕابـوون و وا زرێیان دەپۆشن.

***ریچارد شا*** : ئاه راتکلیـف، خـەونێکی سـامناکم بینـی، تـۆ بڵێـی دۆسـتان و لایـەنگرانمان پشـتمان تێ نەکەن؟

***راتکلیف***: بێگومان ئەزبەنی.

***ریچارد شا*** : ئاه راتکلیف، من دەترسم... دەترسم...

***راتکلیف***: نا گەورەم نا، لە سێبەرو تارماییان مەترسە.

***ریچارد شا*** : قەسەم بە سەنت پۆڵسی موبارەك، ئەو ترسەی ئەمشەو تارماییان خسـتیانە دڵمـەوە، بە دە هەزار جەنگاوەری راسـتەقینەی پـڕ چـەك کـە ریچمونـدی قـەلپیاو ڕابـەریان دەکـات، ئـەوەیان پێنـاکرێ. هێشـتا زۆری مـاوە رۆژ ببێتـەوە، وەرە بـا پێکـەوە گەشـتێکی نێـو چـادرەکان بکـەین و گوێ هەڵخەم بزانم کە س بە تەما نیە خیانەتم لێ بکات. ***(بە دوو قۆڵی وەدەر دەکەون).***

***(لۆردەکان دەچنە خێوەتەکەی ریچموند، ریچموند دانیشتووە).***

***لۆردەکان***: رۆژ باش ریچموند.

***ریچموند***: سەروەران و ئاغایان، ببورن کە بەم خاوی و تەمبەڵییەم دەبینن.

***لۆردەکان***: قوربان خەوی ئەمشەوت چۆن بوو؟

***ریچموند***: خەوی وا خۆشم هەر نەکردووە، هەر کە ئێوە تەشـریفتان بـرد، ئیـدی خـەوێکی خۆشـم پیاکەوت، ما خەون ببینە، لە خەونمدا روحی هەموو ئەوانەی بە دەستی ریچارد کوژرا بوون، لێم

وەژوور کەوتن و تێکڕا مژدەی سەرکەوتنیان دامێ، باوەڕ بکەن هەر چەند ئەو خەونەم بیر دەکەوێتەوە ئۆخژنم لە دڵ و دەروون دەگەڕێ، ئەرێ گەلی براینە چەندی ماوە ڕۆژ ببێتەوە؟
***لۆردەکان***: چی وای نەماوە بۆ سەعات چوار.
ریچموند: کەواتە کاتی ئەوەیە تەدارەکی جەنگ لە خۆ بدەین و سەربازەکانمان بۆ جەنگ تەیار بکەین.

***(گوتارەکەی بۆ ئەو سەربازانەی لە دەوری خێوەتەکەی خڕبوونەتەوە).***

هاووڵاتیانی ئازیز و ئەمەکدار، لەبەر کەمی کاتەکەو هەستیاری حاڵەکە، ناتوانم لەوەی کە گوتوومە پتر قسانتان بۆ بکەم، بەڵام ئەوەتان لەبیر بێ کە: پەروەردگارو عەدالەتی دۆزەکەمان، شان بە شانی ئێمە دەجەنگن، دوعای پیاوچاکان و روحی مەزڵومان وەکو قەڵاو سەنگەری قایم دەمانپارێزن، ئەوانەی ئێمە شەڕیان دەکەین، ریچاردی لێ بترازێن هەموویان حەز بە سەرکەوتنی ئێمە دەکەن نەك بە سەرکەوتنی ئەو زەلامەی ڕێبەرییان دەکات. جا بەڕێزینە کێ ڕێبەری ئەوانە دەکات؟! جگە لە پیاوێکی ستەمکاری پیاوکوژی خوێنڕێژ، پیاوێك کە لە خوێنا پەروەردە بووەو سەڵتەنەت و پاشایەتییەکەشی لەسەر خوێن رۆناوە. پیاوێك کە بۆ مەرامی گڵاوی خۆی کۆی لە هیچ نەکردووەتەوەو ئەوجا کەوتۆتە کوشتن و پاکسازی هەر هەموو ئەوانەی یارمەتیان داوەو گەیاندویانەتە مەرام. بەردێکی بێ نموودو بێ بایەخ بوو، روکەشی سەڵتەنەت و تەخت و تاجی ئینگلتەرا نرخی دایە، سەڵتەنەتێك کە ئەو بە خیانەت و بە نەهەق لەسەری دانیشتووە. پیاوێك کە هەمیشە دژمنی خودا بووە، جا ئەگەر ئێوە بەگژ دژمنی خودادا بچن، خودا وەکو سەربازی خۆی چاودێریتان دەکات و دەتانپارێزێ، ئەگەر لە پێناوی لە نێو بردنی ستەمکارێکدا ماندوو بن و تێبکۆشن، پاش کوشتنی ئەو ستەمکارە، بێ خەم و خەیاڵ، بە ئاشتی و ئاسوودەیی دەنوون، ئەگەر ئەمڕۆ بەرەنگاری دژمنی وڵاتەکەتان ببنەوە، ئەوا سبەینێ لە خێرو بەرەکەتی وڵات، باشترین پاداشتتان دەدرێتێ. ئەگەر لە رای پاراستنی نامووسی ژنەکانتاندا بجەنگن، ئەوا بە رووسووری پێشوازیتان دەکەن و پیرۆزبایی سەرکەوتنتان لێ دەکەن، ئەگەر مناڵەکانتان لە زەبری شمشێران بپارێزن، ئەوا لە پیریتانا، نەوەکانتان چاکەتان دەدەنەوە. کەواتە بە ناوی خوداو بە ناوی ئەم هەموو مافەوە، بەیداخ هەڵکەن، شمشێرەکانتان، شمشێرانی تامەزرۆ و تینوی کوشتار هەڵکێشن، منیش گیانی خۆم لە پێناوی ئامانج و داوا رەواکەمدا لەسەر ئەم خاکە بەخت دەکەم. بەڵام ئەگەر بە مەرام گەییشتم و سەرکەوتنم بە دەست هێنا، ئەوا هەر هەمووتان، وردو درشتتان پاداشتی خۆ وەردەگرن، کەواتە بێ ترس و ئازایانە لە تەپڵان بدەن، فوو بە شەیپوراندا بکەن، خواو سەنت جۆرج! ریچموند و سەرکەوتن! ***(وەدەردەکەون)، (ریچارد شا، و راتکلیف و زێڕەڤانان و سەربازان دەگەڕێنەوە).***

***ریچارد شا***: ئەرێ نورتمبرلاند چی دەربارەی ریچموند گوت؟
***راتکلیف***: گوتی ئەزموون و تەجرەبەی جەنگی نیە.
***ریچارد شا***: راست دەکات. درۆی نەکردووە، ئەی سوری چی گوت؟
***راتکلیف***: بزەیەکی کردو گوتی: "ئەمە بۆ ئێمە باشترە".

***ریچارد شا*** : راست دەكات. بەڕاستی ئەوە بۆ ئێمە باشترە. ***(زەنگی سەعاتەكە لێدەدا)***. زەنگی ئەو سەعاتە بژمێرە. تەقویمێكم بدەیەو پێم بڵێ كێتان ئەمڕۆ هەتاوی دیتوە؟

***راتكلیف***: من نەم دیتووە قوربان.

***ریچارد شا*** : كەواتە، هەتاو نایەوێ هەڵێ، بەپێی تەقویم بوایە، دەبوایە بەر لە سەعاتێك هەڵهاتبا، ئەمڕۆ رۆژێكی رەش دەبێ بۆ یەكێك. راتكلیف؟

***راتكلیف***: بەڵێ قوربان!

***ریچارد شا*** : ئەمڕۆ هەتاو هەڵنایەت، ئاسمان رووی لە سوپاكەمان وەرگێڕاوە و هەوری خۆی بەسەرا داداوە، خۆزیا ئەم فرمێسكە شەونم ئاسایانە، ئەم فرمێسكە تەڕانە لەزەوییەوە هەڵدەقولاَ، ئەمڕۆ هەتاو هەڵنایەت! جا هەڵنایە هەڵنایە! چما بۆ من و بۆ ریچموند وەك یەك نیە؟ ئەو ئاسمانەی روو لە من گرژ دەكات، بۆ ئەویش هەر روو گرژ و مۆنە، ***(نورفۆك بەپەلە وەژوور دەكەوێ).***

***نورفۆك***: قوربان فریاكەون دەست بدەنە چەك، دژمن گەییووەتە مەیدانی جەنگ و مەیدانخوازی دەكات.

***ریچارد شا*** : دەی بجولێن، بەخۆ كەون! ئەسپەكەم بۆ زین بكەن! لۆرد ستانلی بانگ بكەن، پێی بڵێن بەخۆو هێزەكەیەوە پێشڕەوی بكات، بە خۆیشم سەربازەكان بەرەو دەشتەكە دەبەم و لە وێندەرەوە سەرپەرشتی شەڕەكە دەكەم، پێشینەی هێزەكە، بریتی دەبێ لە سوارەو پیادە، تیرەندازان لە ناوەندەوە دەبن، دوك نورفوك رابەرایەتی پیادەكان دەكات، تۆماس ئیرل سوری رابەرایەتی سوارەكان دەكات، وەختێ ئەوان حەرەكەتیان كرد، ئێمەش بە لەشكرەكەی خۆمانەوە دوا بە دوای ئەوان دەچینە شەڕەكەوە، و باشترین هێزی سوارە لەملاو لەولاوە زێڕەڤانیمان دەكەن، ئەمە ئامۆژگاری و نەخشەی منە، هەرنەپێش سەنت جۆرج پشت و پەنامان بێ، تۆ چ دەڵێی نورفۆك؟

***نورفوك***: نەخشەیەكی زۆر بەجێ و ژیرانەیە ئەی پاشای جەنگاوەرو نەبەزم، ئەم بەیانییە ئەمەم لەسەر چادرەكەم دۆزییەوە. **(كاغەزێكی نیشان دەدا).**

***ریچارد شا*** : (كاغەزەكە دەخوێنێتەوە) "ئەی جۆكی* نورفۆك، دڵ بە فشە هیوایان خۆش مەكە، چونكە "دیكون**"ی ئاغات لەلایەن پیاوەكانیەوە مامەڵەی پێكراوە***، كڕدراوەو فرۆشراوە".

ئەمە دەسیسەی دژمنە بەرێزینە هەڕون، هەر كەسەو بچێتە سەر كاری خۆی، زڕە خەونان نامان ترسێنێ، ویژدان، قسەی باوی سەرزاری ترسنۆكانە، هەر لە سەرتاوە بۆ ئەوە دروستكراوە كە دلێرانی پێ بترسێنرێ، سوپا بەهێزەكەمان ویژدانمانە، و شمشێرەكانمان قانون و یاسامانە،

---

* جوكی: نا وی میللی "جون"ـە

** دیكون: نا وی میللی ریچاردە

*** مامەڵە پێكردن: كنایەیە بۆ خیا نەت.

هەڕنەپێش! مەردو مەردانە، بجەنگن، با مل بەم جەنگەوە بنەین ئەگەر نەمان گەیەنێتە بەهەشت، هەموو دەست لە نێو دەست بچینە دۆزەخ!

***(گوتاری ریچارد لە بەردەم لەشکرەکەی)***

لەوەی پتر چتان پێ بڵێم؟ چاك بزانن ئەوانەی ئێوە لێرەدا شەڕیان دەکەن بریتین لە کۆمەڵێك خانە بەکۆڵ، تەڵەکەباز، و ئاوارە و قاشقونج و یاخی لە عەدالەت و یاسا، خڵت و خاشە و گەجەرو گوجەری خەڵکی بریتانی و جوتێرو وەرزێرانی سەرشۆڕ، کە وڵاتە تێرو پڕەکەیان هەڵی هێناونەتەوەو تفاندویانیەتێوە، تا دەست بدەنە سەرکێشییەکی نا ئومێدانە و بە تەحقیق تیا بچن. کە سەیریان کردووە ئێوە لە ئاسوودەییدان و بێ خەم و خەیاڵ لێی دەنوون، ئەم ئاژاوەیەیان ناوەتەوە تا نیگەران و شپرزەتان بکەن، کە دەبینن ئێوە خودانی موڵکن و ژنانی جوانتان هەیە، دەیانەوێ موڵکەکانتان لێ داگیر بکەن و ناموسی ژنەکانتان بەرن و ناویان بزڕێنن، کێش رابەرییان بکات! پیاوێکی بودەڵەی سپڵەو پێ نەزان، کە ماوەیەکی زۆر لە بەریتانیدا، بە پارەی دایکی ئێمە دەژیا؟ کابرایەکی نێرەموکی ناسکۆڵە، کە لە ژیانیا ناڕەحەتی بە خۆوە نەدیوەو ساردی و گەرمی رۆژگاری نەچەشتووە. دەیسا وەرن با ئەم خوێڕیانە، بخەینەوە دەریا، وەرن با ئەم فەرەنسییە بێ شەرەفانە، ئەم لات و لەوێرە لە خۆرازیانە، بە زەبری قامچی بەرەو شوێنی خۆیان، بۆ ئەودیوی دەریایان راوبنەین، وەرن با ئەم سواڵکەرە لە برسا مردووانە، کە برسێتی وەکو جرجی زەلیل و کەساس پرزەی لێ بڕیوون، و لە گیانی خۆ بێزار بوون، تەمبێ خواردوو بکەین و بە زەبری قامچی لە وڵاتی خۆ وەدەریان بنەین، ئەوانەی ئەگەر تەماح و خەونی ئەم دەستکەوتە چەورانە نەبایە، دەبوا لە برسێتی و داماویدا خۆ لە قەنارە بدەن، بەڵێ با ئەوانە بە زەبری قامچیان لە وڵاتی خۆ وەدەربنەین، جا ئەگەر قەرار بێ ببەزین با بە دەستی پیاوان ببەزین، نەك بە دەستی ئەم زۆڵ و حەرامزادانەی خەڵکی بەریتانی، کە باب و باپیرانی ئێمە لە خاکی خۆیاندا سەرکوتیان کردوون و تاڵاویان پێ نۆشتوون و کردوویانن بە پەندی مێژوو و ریسوایان کردوون، یانی غیرەتە بۆ ئێمە رێگەی ئەوانە بدەین خێرو بێری خاکەکەمان بخۆن؟ و لەگەڵ ژنەکانماندا رابوێرن و کیژانمان رەدوو بخەن؟ ***(لەدوورەوە دەنگی دۆڵ دێت).*** گوێ بگرن، گوێم لە دەنگی تەپڵی ئەوانە، ئەی خەڵکی نەجیبی ئینگلتەرا بجەنگن، شێرە پیاوان بجەنگن، تیرەندازان، بەرتیریان بدەن، کاسەی سەریان هەڵگرن! ئەسپە ڕەسەنەکانتان بەر مامێزان بدەن و بە ناو خوێنا تاو بدەن، ئاسمان ئاگاداری نێزەکانتان بێ، ***(پەیکێك وەژوور دەکەوێ).*** لۆرد ستانلی چی گوت؟ هێزەکەی دێنێ یان نا؟

***پەیك***: ئەزبەنی، نایەت.

***ریچارد شا*** : کەواتە لە ملی جۆرجی کوڕی بدەن.

***نورفوك***: گەورەم، دژمن لە زۆنگاوەکە پەڕیوەتەوە، با کوشتنی (جۆرج ستانلی) بخەینە دوای جەنگ.

***ریچارد شا*** : من هەزار دڵی گەورەم لە سینەدایە، بەیداخەکان هەڵکەن! پەلاماری دژمن بدەن، ئەی سەنت جۆرجی موبارەك، ئەی ئیلهامبەخشی دێرینەی ئازایەتی و دلاوەریمان، ئازایەتی

**ئـەژدیهایانی تورەمـان پـێ ببەخشـە، پـەلاماریان بـدەن! سـەرکەوتن بەسـەر کڵاوخودەکانمانـەوە نیشتووەتەوە!**

***(هێرش دەبەن)***

## دیمەنی چوارەم

## شوێنێکی دیکەی شەڕگەکە

(هەراو هەنگامە و جمو جۆڵ، نورفوك و هێزی شەڕکەر وەژوور دەکەون، کاتسبی لێی دەچێتە پێشێ).

***کاتسبی***: فریاکەوە، جەنابی نورفوك فریا کەوە، فریاکەوە! فریاکەوە! پاشا حەشریێ دەکات لە تاقەتی بەنی بەشەردا نیە، رەنگ نیە دژمن پەلامارێك بدات، یەکسەر بەرپەرچی داوەتەوە، بەڵام ئەسپەکەی کوژراوە، ئەمێستا بەپای پیادە دەجەنگێ و لە جەرگەی مەرگا بۆ ریچموند دەگەڕێ، فریای کەوە ئەزبەنی، دەنا شەڕەکە دەدۆڕێنین، *(دەنگی شەیپور، ریچارد شا وەژوور دەکەوێ)*.

***ریچارد شا***: ئەسپ! ئەسپ! سەڵتەنەتەکەم بە ئەسپێك! ئەسپ.

***کاتسبی***: قوربان بگەڕێوە، من ئەسپت بۆ پەیدا دەکەم.

***ریچارد شا***: ئەی کۆیلە! ژیانی من زارێکە و هەڵمداوە، جا نەردی بەخت چی هانی، من پێی رازیم، پێم وایە شەش ریچموند لە مەیدانی شەڕەکەدان، ئەمڕۆ کە پێنج دانەیانم لە بری ئەو کوشتووە، ئەسپ! ئەسپ! هەڕاج، سەڵتەنەتەکەم بە یەك ئەسپ! *(وەدەردەکەون)*.

## دیمەنی پێنجەم

## ( بەشێکی دیکە لە شەڕگەکە )

**( دەنگی شەیپور، ریچارد و ریچموند بەدەم شەڕەوە وەژوور دەکەون، ریچارد دەکوژرێ، پاشەکشەو شەیپور، ریچموند دەگەڕێتەوە، داربی "ستانلی" و چەندین لۆردی دیکە وەژوور دەکەون، و تاجەکە بۆ ریچموند دەبەن ).**

***ریچموند***: هاوڕێیانی سەرکەوتوو، سوپاس بۆ خواو شمشێرو بازووی ئێوە کە سەرکەوتین و ئەو سەگە خوێنڕێژە تۆپی.

***داربی :*** ئەی ریچموندی جوامێر، شوکر ئاواتەکانمان لە تۆدا هاتەدی. بڕوانە ئەمە ئەو تاجەیە کە لە مێژە داگیر کرابوو، و لەسەری ئەو غەدارە خوێنڕێژەم داگرتووە، تاسەری تۆی پێ برازێنمەوە. دەی لەسەری بنێ، بە خۆشی و بە تەمەنی درێژ بۆ چاکە بەکاری بێنە.

***ریچموند***: ئەی خودای مەزن، خاوەنی ئاسمانان لە زاری بنۆڕە!، بەلام تۆ جارێ پێم بڵێ بزانم، جۆرج ستانلی بچکۆلە ماوە یان نا؟

***داربی***: بەڵێ، قوربان ساغ و سەلامەتە و لە شاری لیسترە، ئەگەر جەنابت بفەرمووی، دەتوانین ئێستا بۆ ئەوێندەر بڕۆین.

***ریچموند***: باشە، کێ لە نێودارانی هەردوولا کوژراوە؟

***داربی***: جۆن دوك نورفوك، والتەر لۆرد فیرەرز وسێر روبەرت بروکنبری، و سێر ولیام براندون.

***ریچموند***: دەیسا بە رێك و پێکی و بەشێوەیەك کە شایستەی پێگەی خۆیان بێ، بیان نێژن، هەروەها جاڕی بوردنی گشتی بۆ ئەو سەربازە هەڵاتووانە دەربکەن کە دەخوازن بگەڕێنەوە ریزی ئێمە، ئەوجا سۆزو پەیمان بە خۆدەدەین کە هەردوو گوڵی سپی و گوڵی سوور* یەك بخەین. سا ئەی ئاسمان کە ماوەیەکی زۆر لە داخی دژمنایەتی ئەوان مۆنت کردبوو، ئەمێستا بە رووی ئەم یەکێتییە جوان و موبارەکەدا بگرژێوە و بزەت بکەوێتە سەر لێوان. باوەڕ ناکەم خاینێکمان تێدابێ کە گوێی لەم دوعاو نزایەی ئێمە بێ و نەڵێت ئامین. ئینگلتەرا ماوەیەکی زۆرە شێت بووەو زام و داغێکی زۆری بە خۆیەوە ناوە، برا، کوێرانە و گومڕایانە خوێنی برای خۆی رشتووە، باوك نەزانانە و بێ پەروا کوڕی خۆی کوشتووەو کوڕ ناچار بووە بابی خۆی بکوژێ. هەر هەموو ئەمانە هەردوو ماڵباتی یورك و لانگستەری لێکدی دابڕی و زۆریان لە سەرکەوت، جا ئێستا با نەوەی رەسەن و ئازادی ئەم دوو بنەماڵە پاشایە، ریچموند و ئەلیزابت و جێنشینانی راستەقینەی هەر یەکێك لەو دوو ماڵباتە پاشایە، بە گوێرەی دەستووری پاکی پەروەردگار وەسڵەت بکەن و هەردوو ماڵباتی یورك و لانگستەری ناکۆك و هەڤدژ یەك بخەن، خوا بە فەزڵ و کەرەمی خۆی ئەم یەکێتییە بۆ منداڵەکانیان پایەدار و بەرقەرار بکات، تا ئایندەیەکی پڕ لە

* گوڵی سپی و گوڵی سوور: ئارم و دروشمی هەردوو ماڵباتی یورك و ماڵباتی لانگستەر بوو، کە لەسەر سەڵتەنەتی ئینگلتەرا شەڕیان بوو.

**ئاشتی و لێبوردەیی، پڕ لە بەرەکەت و خۆشگوزەرانی، پڕ لە ڕۆژانی جوان و شادمانی دابین بکەن. ئەی خوای گەورە، پەروەردگاری مەزن، ئەی دەهەندە ودلۆڤان، شەوکەتی ئەو خاینانە بشکێنە کە دەخوازن ئەو ڕۆژە خوێناوییانە بگێڕنەوەو ئینگڵتەرا غەرقی ڕوبارانی خوێن بکەن، فرمێسکی ئینگڵتەرا بڕێژنە ڕووبارانی خوێنەوە،خودایا ئەو کەسانەی کە بە خیانەتی خۆیان سەلامەتی و ئاشتی ئەم مەرزو بوومە موبارەکە زامدار دەکەن، بەسەر دنیاوە مەیەڵە، تا لە فەڕو بەرەکەتی ئەم وڵاتە مەحروم بن. ئێستا کە زامەکانمان سارێژ بووەو جارێکی دیکە ئاشتی گەڕاوەتەوە، خودایا ئەم ئاشتیەمان هەر پایەدار و بەردەوام بێ. ئامین.**

***(وەدەر دەکەون).***

***تێبینی:*** **لە ساڵی ١٩٩٢دا ئەم دەقەم لەم سەرچاوەیەوە کرد بە کوردی:** ریتشارد الثالث. ترجمة: الدكتور عبدالقادر القط مراجعة: الاستاذ حسن محمود، الاستاذ ابراهيم زكي خورشيد مطابع دار المعارف بمصر سنة ١٩٦٨، جامعة الدول العربية الادارة الثقافية. **پاشان لەگەڵ ئەم وەرگێڕانە فارسیەدا، بەراوردم کردو لە هەندێ شوێنی زۆر کەمدا پشتم بە دەقە فارسیەکە بەستووە کە ئەمەیە:**

**ریچارد** شاه سوم، اثر **ويليام شكسپير ترجمەی:** رضا **براهنی چاپ اول** ١٣٨٣ (٢٠٠٤) **نشر و پژوهش دادار.**